د. خانا ئۆمەرخالی

# ئێزدیاتی

## جڤاک، سەمبول، رێتووەل و میت

وەرگەرا ژ ئینگلیزی
ئەرگین ئۆپەنگین

گهۆرینا ژ پیتێن لاتینی
کوڤان خانکی



هەولێر ٢٠١١

د. خانا ئۆمەرخالی

وەرگەرا ژ ئینگلیزی

ئەرگین ئۆپەنگین

گهۆرینا ژ پیتێن لاتینی

کۆڤان خانکی

* ناوی کتێب: ئێزدیاتی (جڤاك، سەمبۆل، ریتووەل و میت).

* ناوی نووسەر: د. خانا ئۆمەرخالی.

* سەرپەرشتی هونەری و بەرگ: عوسمان پیرداود

* دیزاین: عیسام موحسن.

* بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە(١٢٠).

* چاپخانەی حاجی هاشم — هەولێر.

* تیراژ: ٥٠٠ دانە.

* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی( ٥٧٧ )ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە.

* چاپا دووەم سەرراستکری و زێدەکری یە.

* چاپا یەکەمین دەزگەها ئاڤەستا، ٢٠٠٧.

– خانا ئۆمەرخالی (ئوسۆیان) د سالا ١٩٨١ ێ ل پایتەختا ئەرمەنستانێ، باژارێ رەوانێ ژ دایك بوویە. کوردا ئێزدی یە، ژ مالا پیرێن ئۆمەرخالی تێ. سالا ٢٠٠٢ێ زانکۆیا سانکت-پێتێرسبوورگ یا دەولەتی فاکوولتەیا رۆژهلاتناسییێ پارا زمانزانییێ یا ئیراناسی و کوردناسییێ تەواو کر (B.A.) و د سالا ٢٠٠٤ێ دە دیپلۆما ماجستێرێ دیناسییێ (M.A.) ستاند. دۆکتۆرا (Ph.D.) خوە ل سەر دینێ ئێزدیان، د سالا ٢٠٠٦ێ دە ل فاکوولتەیا فەلسەفە و سیاسی ل پارا دیناسییێ دە قەداند. سەمینەر ل سەر دینێ ئێزدیان چێکرنە و بەشداری د گەلەك کۆنفرانسێن زانستی دە کریە. خانا ئۆمەرخالی سالا ٢٠٠٥ د زانکۆیا ئالمانیایێ گەۆرگ ئاوگوست دە (Georg-August Universitat Göttingen) ل سەر زمانێ کوردی و هەر وسا ژی ل سەر ئێزدیاتییێ دەرسان د دە. نێزیکی ٢٠ گۆتارێن زانستی دەرهەقا بیر و باوەریا دینێ ئێزدیاتییێ دە ب زمانێ رووسی، ئینگلیزی و کوردی نڤیسینە. کتێبا وێ یا پێشییێ ب ناڤێ "ئێزدیاتی، ژ کوراهیا هەزار سالان" (سانکەت-پێتێرسبوورگ، ٢٠٠٥)ب رووسی چاپ بوویە.

کتێبێن وێ ل سەر ئێزدیاتییێ ئەڤن:

– مێتۆدەکە ئانالیزا قەولێن ئێزدیان ل سەر مەسەلا قەولێ ئۆمەر خالا و هەسن چنێری. ب هەڤکاریا کۆڤان خانکی. ئاڤێستا، ستەنبۆل، ٢٠٠٩.

- Yezidism in Europe: Different Generations Speak about their Religion. Ph.G. Kreyenbroek in collaboration with Z. Kartal, Kh. Omarkhali, and Kh.J. Rashow. Göttinger Orientforschungen, III. Reihe: Iranica. Neue Folge; 5. Harrassowitz, Wiesbaden, 2009.

– ئێزدیاتی: جڤاك، سەمبۆل، ریتووەل. وەرگەرا ژ ئینگلیزی ب کوردی: ئەرگین ئۆپەنگین. ئاڤەستا، ستەنبۆل، ٢٠٠٧.

- Jezidizm. Iz glubiny tysjacheletij [ئێزدیاتی. ژ کوراهیا هەزار سالان]. St Petersburg, 2005.

تێبینی: نڤیسارێن د ڤێ کتێبێ دە، ئێن ب ناڤێ "جهوارێن ئێزدیان کۆچبەرێن جیهانێ"، "شرۆڤەکرنا سەمبۆلا ئێزدیان: تاووسی مەلەك"، " جەژنا خدر نەبی و خدر لیاس" و "فەرهەنگا تێرمێن ئێزدیان " ژ ئالیێ نڤیسکارا کتێبێ خانا ئۆمەرخالی ڤە ب کوردی هاتنە نڤیساندن. نڤیسەرێن دن ئەرگین ئۆپەنگین ژ ئینگلیزی وەرگێڕایە کوردی و نڤیسکار کوردیا وان خوەندیە و پەسەند کریە.

# ناڤەرۆك

# لیستا فۆتۆ و رەسمان

**تێبینی:** رەسم و فۆتۆیێن کو چاڤکانی لێ نەهاتنە دیارکرن، نڤیسکارێ ب خوە دابین کرنە.

# پێشگۆتن

ل دوو وەختەکی درێژ کو دینێ ئێزدیاتی هەم ژ ئالیێ ئاکادەمیکان هەم ژی ژ ئالیێ گەلێ رۆژئاڤا ڤە هەتا دەرەجەکە مەزن هاتە ئیهمال و پشتگوهکرن، دو دەه سالێن داوی شاهیدی ل زێدەبوونەکە مەزن ئا زانیارییێن ئاکادەمیك ئێن ل سەر ڤی دینی کریە. ل گەل هندەك پێشکەتنێن دیار د قادا ئاکادەمیك دە، جی ب جیبوونا جەمائەتێن مەزن ئێن ئێزدیان ل وەلاتێن ئەورووپاییێ، بوو سەبەبێ ئەلاقە و مەیلەکە نوو و پر – ئالی ل سەر پاشخانەیێن جڤاکی و دینی یێن ڤێ جڤاکێ، و هەلبەت بوو سەبەبێ وێ هندێ کو ژ ئاگاهیێن هەتا سالێن ١٩٨٠ئان بەردەست گەلەك زێدەتر ئاگاهی و زانیاری ب دەست ڤە بێن.

لێ بەلێ، پرانیا ڤان ئاگاهی و زانیاریان ب هەموو واتەیا پەیڤێ "ئاکادەمیك" بوون: بێهتر بۆ لێکۆلینەران بەردەست بوون ئەو، و مژارێن ل ور دهاتن ڤەکۆلان بێهتر ب مەبەستا هەلکرنا پرس و مژولیێن دیرۆکناسێن دینی، ئانترۆپۆلۆج ئان ژی سۆسیۆلۆجان بوون، ئاگاهیێن کوور ل سەر رەئالیتەیێن هەیی کو شکل و شێوە ددنە جڤاك و فکر و بۆچوونا جڤاکی، هەر چەند وەك ئالیەکی گرنگ ئێ ئێزدیاتیێ بێ قەبوولکرن ژی، ب دورستی بەردەست بوون ژ بۆ لێکۆلینەرێن نە – ئێزدی. ژ ئالیێ دن ڤە، نفشێ ئەولێ ئاکادەمیکێن ئێزدیان ئێن کو ل سەر دینێ خوە دخەبتین، بێهتر ب ڤەدانا پێدڤیێن جیهانا ئاکادەمیك ڤە مژوول بوون کو بال و مەیلا خوە بدنە سەر ڤان تشتان، ڤان تشتێن کو قاسی زمانێ دایکێ ناس و ئاشنا بوون بۆ وان و کو وان وەسا فەرز دکر کو ئەو تشت ژ ئالیێ مەیل و ئەلاقەدارێن دینێ وان ئێن نە – ئێزدی ڤە ژی دهاتن زانین.

ژ بەر ڤێ هندێ ئەم خوەش بەختن د. خانا ر. ئۆمەرخالی، نوونەرەکە زیرەکا نفشێ دویەمێ ئێزدیناسێن ئێزدی، هەم گەلەك بەهرەدارە، هەم ئاکادەمیکەکە پەروەری یە و هەم ژی کەسەکە وەسا یە کو حەز و ئەڤینا کوورا دینێ خوە دگهینە سرووش و حوکمێن راست دا کو بکارە وی دینی باشتر تێبگهینە و چێتر بدە زانین. د ڤێ خەباتێ دە، وێ، هەژمارەکە گۆتاران گەهاندنە هەڤ کو تێ دە بابەتێن رۆژانە یێن ئاواییێ جڤاکی و ریتووەلێن دینی ب ئاوایەکی وەسا نیقاش کرنە کو نە تەنێ برەکە ئالیێن هەتا نها خەریب و کێمناسێن ڤی دینی ل بەر

خوەندەڤانان رادخە، بەلکی هنەك رێکێن تێگهشتنا فکر و بۆچوونا دنیایێ و رامانا دینی یا کو د بنگەها وان دەیە ژی دابین دکە بۆ خوەندەڤانان.

ب وەشاندنا ڤێ کتێبێ، د. ئۆمەرخالیێ خزمەتەکە مەزن کریە بۆ کوردۆلۆج و دیرۆکناسێن دینی و وان هەموو کەسێن کو خوەدان مەیل و ئەلاقەنە ل سەر ڤێ ترادیسیۆنا دینی یا دەولەمەند و قەدیم.

**فیلیپ گ. کرێیێنبرۆك**
**گۆتتینگێن، تیرمەه ۲۰۰۷**

## پێشگۆتن

سەر سەبەبێ وەشاندنا ڤێ کتێبا د دەستێن وە دە ئەوە کو ئێزدیاتی، دناڤ بێهترێ کوردان ب خوە دە ژی، هینا وەکی مەتەلەکێ مایە و لازمە ب کوور و ب دەتای بێ کفشکرن. ئارمانجا ڤێ کتێبێ نە ڤەکۆلینا هەموو پرسێن دینێ ئێزدیان ئێ دەولەمەند و ترادیسیۆنا ڤی دینی یە، بەلکو بێهتر ڤەکۆلینا هنەك پرس و ئالیێن ئێزدیاتیێ یێن گرنگ و ئالۆزە، ئەڤ کتێب د ناڤ چار پاران دە هاتیە دابەشکرن، هەر پارەك ژ بۆ ئالیێن جهێ یێن لێکۆلینا ئێزدیاتیێ هاتیە تەرخانکرن. د ڤێ کتێبێ دە مژارێن وەها هاتنە ڤەکۆلان: ئاوایێ سوسیال ئا جڤاکا ئێزدیان، سیستەما قەبیل و ئەشیرێن ئێزدیان، سەمبۆلیزم، دۆگما و ریتووەلێن دینی. هەر پارەك ژ دو گۆتاران پێکهاتیە و گۆتار وسا هاتنە نەقاندن کو خوەندەڤان بکارن ژ پەرسپەکیفێن جهێ فکرەکە گشتی ب دەست بخن ل سەر ئێزدیاتیێ" هەر وها د هەر پارەکێ دە پرسەکە گرنگ و ئالۆز ئا ژ وێ قادێ تێ ڤەکۆلان.

# دەستپێك

دەما یەك رووپەلێن دیرۆكا كوردستانێ دقەلبینە، دكارە هەژمارەكە مەزن ئا دین و مەزهەبێن جهێ ببینە ل سەر ڤی ئەردی كو ل گەل دەم و دەورانان خویا بوونە، ژ هەڤ جودا بوونە، بهەڤرە ژیانە، بوونە مالێ زەمانێن بەرێ و دیسا خویا كرنە ... ژیانا روحانی تم و دایم دەولەمەند بوویە ل سەر ئاخا كوردستانێ. ئەڤ كتێب ، ژ بۆ یەك ژ دینێن هەری زێدە ڤەشارتی و لەوما دینەكی هەری سەیرێ رۆژهلاتا ناڤین، ئان كو ئێزدیاتیێ هاتیە تەرخانكرن.

دینێن دناڤ كوردان دە. ئیرۆ بێهتر ژ سێیان دوییێ هەموو كوردان باوەری ب ئیسلامێ تینن. پڕانیا كوردێن نها مسلمانێن سنی نە، لێ نفووسەكە كوردێن شیعە ژی هەیە، ئیسلامێ دەما كو ئەرەبان ئیرانا ساسانی داگیركر (سەرێ سەد سالا ٧ ئان) دەستپێكر، هنگی ل ناڤ كوردان بەلاڤ بوو.

ل ناڤ كوردان هنەك تەریقەتێن سۆفیان هەنە. سۆفیاتی[1]، ب ناڤێ دن "تەسەووف"، مەیلەكە میستیكا مەخسووسە د ئیسلامێ دە كو ب یا باوەرمەندێن وێ مومكنە كو مرۆڤ ب خێرا تەجروبەیا شەخسی و پسیكۆلۆژیك راستەراست بكەڤە تێكلیەكە روحانی ل گەل خوەدێ. ئەڤ یەك ب بجیئانینا پركتیكا تایبەت، "تەریقە"یێ پێك بێ. ئیرۆ ل كوردستانێ تەریقەتێن سەرەكی قادری و نەقشەبەندی نە. ب تەنێ ترادیسیۆنێن هەرێمی هەنە كو ژ مەرە تشتنان بێژن دەربارێ كۆكێن قادریێن ل كوردستانێ دە" بەس فكرا گشتی ئەوە كو قادری هێژ گەلەك بەری نەقشەبەندیان ل ور بوونە.

هەژمارەكە زێدە یا كوردان ژی باوەری ب دینێ ئەهل–ی هەق (خەلكێ راستیێ و خەلكێ خوەدێ) تینن، كو كۆكێن وێ و هەروها كۆكێن ئێزدیاتیێ رەنگە بگەهنە مەدەنیەتا ئیرانی یا بەری ئیسلامێ، مەدەنیەتا ئیندۆ– ئیرانی. ئیلم و زانیاریێن مە یێن هەیی دیار دكن كو مانەندیێن (وەكهەڤی) دناڤبەرا ترادیسیۆنێن

[1] تێرما "سوفیسم" (سۆفیاتی) جارا ئەول د ١٨٢١ ئان دە ژ ئالیێ ف.تۆلوكێ پرۆفیسۆرێ تەیۆلۆژیێ ڤە د خەباتا وی یا دۆكتۆرایێ دە هاتیە بكارئانین.

ئەهلێ هەق و ئێزدیاتییێ دە، تایبەتی کۆزمۆلۆژیێن وان، گەلەکی نێزیکی هەڤن. باوەرمەندێن دینێ ئەهل-ی هەق کو ژ دینێ خوە رە پرانی "یارەسان" دبێژن، ل کوردستانا رۆژهلات دژین.

**ئێزدیاتی**. ئێزدیاتی هەرگاڤ دینەکی گەلەك گرتی و سردار بوویە، ب تایبەتی ژی ژ بۆ ئالیگرێن مەزهەبێن دن. ژ بەر ڤێ یەکێ یە کو بەس سەییاهان دکاری زانیارێن سەرڤەیی ب دەست بخن دەربارێ ئێزدیاتییێ دە، و زانیارییێن دینی یێن هەقیقی تم وەکی سر و مەتەلەکێ مان ژ بۆ وان. دئەنجاما ڤێ دە، ل سەر ئێزدیاتییێ گەلەك چیرۆکێن چێکری و دوور ژ راستییێ کەتنەناڤ لیتەراتۆورێ دە. ئێزدیان، هەر وەکی جڤاکێن دیتر ئێن نەتەوەیی و دینی کو قەوی ناکەڤنە بەر تەسیرا دین و کولتورێن دەرڤەیی و هەروها بێهتر ترادیسیۆنێن دەڤکینە، عەدەت و باوەرییێن خوە ژ یێن دن چێتر پاراستن، تایبەتی ژ وان ئێن نڤیسکی. فاکتۆرەکە دیتر ئا ل گەل ئێزدیان ژ بۆ پاراستنا دینێ وان، هەرێمێن وان ئێن چیایی بوو کو تم لێ مەسکوون بوون.

**ناڤ** . ئێزدی ژ خوە رە دبێژن "ئێزدی" و ژ دینێ خوە رە دبێژن "ئێزدیاتی" ئان "ئێزدیتی" هنەك زانیار و ئێزدی ئیددیا دکن کو ب ئیهتمامەکە مەزن کۆکا ڤێ پەیڤێ ب ئاڤەستایی یە، کو د ئاڤەستاییێ دە پەیڤا **یازاتا** (yazata)، کو پەیڤەکە دڤێتییێ یە د حالێ چێبوار دە و ژ کۆکا -یاز (yaz..)ئا ئیرانی یا کەڤنارە هاتیە، تێ واتەیا "یێ کو دڤێ لێ بێ پەرستن". ئێزید ئان ژی ئێزدی، خوەدێ ب خوە یە د ئێزدیاتییێ دە : " ئێزید پادشێ منە" دبێژە د قەولێن ئێزدیان دە.

**نفوس و ئەردێ وان**. تو دانە و ئاگاهیێن تەکووز و راست نینە دەربارێ نفووسا ئێزدیان دە ب تایبەتی ژ بەر کو گەلەك جڤاکێن ئێزدیان ل وەلاتێن جهێ دژین. ل گەل ڤێ، ل گۆری تەخمینێن نەرەسمی، نفووسا ئێزدیان ل تەڤاهیا دنیایێ ژ ٧٠٠-٨٠٠ هەزاران زێدەترە، دگهیژە ملیۆنەکێ، کو ئەڤ هژمار دبە ٢،٣٪ ێ تەڤاهیا نفووسا کوردان. ئێزدی پرانی ل کوردستانا ئیراقێ دژین، ب تایبەتی ل

هەرێما چیایی یا شنگال و شێخانێ. ئێزدی ل دو گوندێن ب ناڤێن باشیقە و بەحزان ژی دژین. ئەو هەر وها ل ترکیە و سووریەیێ ژی دژین، لێ ئەکسەریەتا وان کۆچ کرنە ئەوروپایێ، ب تایبەتی بۆ ئالمانیایێ کو نها ل ور نفووسەکە ئێزدیان ئا دۆرا ٥٥ هەزاران هەیە، هەژمارەکە کێم ئا ئێزدیان ل ئیرانێ دژین. ل وەلاتێن سۆڤیەتا بەرێ، ب پرانی ل ئەرمەنستان و گورجستانێ دژین کو پرانیا وان د سەرێ سەدسالا ٢٠ئان دە و پشتی زەختێن دینی یێن ئیمپاراتۆریا ئۆسمانیان هاتنە ل ئەرمەنستان و گورجستانێ ب جی بوونە. د ئەنجاما کۆچبارکرنا جەماوەری یا ژ ئەرمەنستان و گورجستانێ ژ بەر تەنگاسیێن ئابۆری ل دوو هلوەشینا سۆڤیەتێ، ئێزدی دانە زۆرێ و مەجبوور کرن کو بار بکن بۆ رووسیایێ (ب گشتی ٧٠–٨٠ هەزار). ئێزدی نها ل ئوکرانیایێ ژی دژین" هەژمارەکە وان ئا کێم ژی ل فەرانسا، بەلچیکا ، هۆلەندا و وەلاتێن یەککرتی یێن ئەمریکایێ دژین.

**ناڤەندا ئێزدیان ئا دینی–لالش.** تەکانە ناڤەندا دینی و ریتووەلێن کو ب مەراسیمان تێنە بجیئانین لالشە کو ل نێزیکی مووسلێ ل کوردستانا ئیراقێ، ل دەڤەرا شێخانە. ب ئیهتیمامەکە مەزن لالش، د دەمێن بەری خریستیانییێ دە هاتیە ئاڤاکرن. ب یا میتۆلۆژی و ئەدەبیاتا دەڤکی یا ئێزدیان، لالش ل ئەینی وی جی هاتیە ئاڤاکرن کو خوەدێ جارا ئەول ئەردێ دنیایێ لێ ئافراندیە. کانیا پیرۆزا ئێزدیان، کانیا سپی ل ورە کو ب ئاڤا وێ زارۆکێن ئێزدیان تێنە "مۆرکرن" (باپتیز کرن). ژ بەر کو ئێزدی هەموو لالشێ ب جهەکی پیرۆز دزانن، پرانیا وان نە تەنێ ژ بۆ زیارەتبوونێ، بەلکی ب هیڤیا کو ژ نەخوەشیێن خوە ب تەمامی خەلاس ببن ژی دچنە ور:

**کەسێ برینا وان هەستە،**
**زوو لالشا نوورانی قەستە.**

**زمان.** ئێزدی ب زاراڤێ باکورێ زمانێ کوردی، ئان کو ب کورمانجی دئاخڤن و قەول و بەیتێن وان ب ڤی زاراڤەیی هاتنە چێکرن.

**سالنامه**. ئێزدی سالنامەیا رۆژهلاتی بکار تینن کو سێزده رۆژان دکەڤە پاش سالنامەیا گرەگۆریەن، ئان کو سالنامەیا ل گۆری ژ دایك بوونا ئیسا. هەموو دانە و ئاگاهیێن جەژنێن ئێزدیان ل گۆری ڤێ سالنامەیێ تێنە ناڤکرن.

**تەکستێن پیرۆز و قەول**. دو تەکستێن پیرۆز ئێن ئێزدیان ئێن گهشتنە رۆژا مە، "جەلوە" و "مسحەفا رەش"، ب زمانێ کوردی و ب پیتێن مەخسووس هاتنە نڤیساندن کو ئەو ئەلف و بێ ب سەرێ سەد سالا ٢٠ئان دە ژ ئالیێ م. بتنەر ڤە هاتنە دەشیفرەکرن. نڤیساندن ل گۆری فکرا ئێزدیان ئاقلبەندیا (زانیاریا) سریێ، لۆما دڤێ قەدر ل دۆگمایێن دینی و فکرێن خوەدێناسان بێ گرتن و ئەو، ژ مرۆڤێن کو دینێ دن دهەبینن بێنە پاراستن. جارنا ژی وسا ڤەدشارتن، کو ئیزن نەددان وەکی مرید ژی، ژ شێخ و پیران علمێ دین بزانبن. دەستوورا خوەندن و شرۆڤەکرنا تەکستێن پیرۆز تەنێ یا روحانیان بوو، دبە، ب ڤی سەبەبی ژی بەلاڤبوونا تەڤاهیا کتێبێن پیرۆز نەبوو و وان ل سەر ژیانا دینی یا رۆژانەیە ئێزدیان تەسیرەك مەزن نەکر. دینێ ئێزدیان بێ نڤیسار و ب دەڤکی ژ نفشەکی هەتا نفشێ دن ژ ئالیێ دێ و باڤان ڤە ب زارۆکان دهاتە ڤەگوهاستن. کۆکا علمێ ئاینێ ئێزدیان، نە ئەوقاس د دو کتێبێن موقەدەس دە هاتیە بەیانکرن، لێ فەرزی و قیمەتی بۆنا لێکۆلین و شرۆڤەکرنا ئێزدیاتی قەول و بەیتێن ئێزدیانە. بێ وان ب علمێ دینی یێ ئێزدیان و دوعاکرنا وان گومان نابە. ب قایدێ قەول و بەیت دسترێن د دوو چووینا دەف و شبابان.

**خوەدێ**. ئێزدیاتی دینەکی یەك خوەدایی یە. ئێزدی ژ بۆ یەزدان، خوەدێ، ئێزید، ئێزدان– دوعا دکن. ئێزدی باوەری ب یەك خوەدایی تینن و هەروها هەفت سەرمەلەکان دحەبینن، کو ئەو سەرمەلەك ژ ئالیێ وی ڤە بەری ئافراندنا دنیایێ هاتبوونە ئافراندن.

**کۆسمۆگۆنی (ئافراندنا کایناتێ)**. خوەدێ ئەول دوڕەك دورست کر، پشتی هەر هەفت سەر مەلەك ئافراندن. پشتی هنگی دوڕ پژڤیا، و ب پژڤینا خوە رۆناهی

ئانی و ئەو دنیایا ئـەم پـێ دزانـن رەنگانـد. دنیـا مـابوو بـۆ نـەزارەتا هـەفت سـەر مەلەکان. رۆژا کو خوەدێ دەست ب ئافراندنێ کر شەمی بوو:

**شەمییێ دانی ئەساسە،**
**چارشەمێ بڕی کراسە،**
**ئینییێ دنیا کر خلاسە.**[1]

وی سەر مەلەکێ ئەزازیل ئەفراند" و ئـەو تاووسـی مەلەکـە "کـو ئـەو مـەزنێ هەموویان"وەك کـو دبێـژە د "مـسحەفا رەش"دە. نـاڤێ هـەفت سـەر مەلـەکان و تەمـسالێن وان ئـێن ل سـەر دنیـایێ و رۆژێـن ئافرانـدنا وان ل " مـسحەفا رەش" وسانە:

یەك شەمی ئەزازیل — تاووسی مەلەك
دوشەمی دەردائیل — شێخ حەسەن (شێخ سن)
سێ شەمی ئسرافیل — شێخ شەمس (شێشمس)
چار شەمی میکائیل — شێخ ئەبو بەکر (شێخو بەکر)
پێنج شەمی ئەزرائیل — سجاد — دین (سجادین)
ئین شەمنائیل — ناسر ئە —دین (ناسردین)
شەمی نوورائیل[2] — فەخر ئێد — دین (فەخرەدین)

ئێزدی باوەر دکن کـو پـشتی ئافرانـدنا دنیـایێ خـوەدێ دنیـا ئەمانـەتی ڤـان هەفت سەر مەلەکان کر. دقەول و بەیتێن دینی دە ناڤێ وان " هەفت سورِ"ە.

**تاووسـی مەلـەك.** د سیـستێما دینـێ ئێزدیـان دە، جهـەکی گەلـەك گـرینگ تاووسی مەلەك دگرە، کو ب شکلێ تاووس نیشان دکـن. بـەرێ، چـەند نڤیسکاران تاووسـی مەلـەك وەك "نیـشانێ خرابـی" ب نـاڤ دکـرن و ئێـزدی ژی وەك "خرابـی پەرست" حەسێب دکرن، کو نە راستە، گۆرا فکرێن دینـی یـێن ئێزدیـان ب خـوە،

---

[1] ب گۆتنێن پیر تۆسنێ قەرۆ، ئەرمەنستان. قەولێ زەبوونێ مەکسوور.
[2] د هنەك ڤاریانتان دە هوون دکارن ناڤێ وی وەکی "توورائیل" ژی ببینن.

تاووسی مەلەك یەك ژ هەفت مەلەكان بوو، كو خوەدێ ئەو رۆژا یەك شەمیێ، ئەولێ ئافراند. ئەو جیێ هەرە مەزن د كۆسمۆلۆژیا ئێزدیان دە دگرە.

شێخ ئادی. بۆنا ئێزدیاتیێ د دیرۆكیێ دە فاكتۆرەك گەلەك فەرز و گرینگ شێخ ئادی و علمێ وی بوو، كو د ناڤبەرا سالێن ١٠٧٣ و ١١٦٢ ئان دە دژیا. د وەختێ وی دە ئێزدیاتی ژ گەلەك ئالیان ڤە هاتیە رێفۆرمكرن. ب فكرێن ئێزدیان شێخ ئادی نە تەنێ مەرڤەك دیرۆكی بوو كو د ئێزدیاتیێ دە رێفۆرم چێكربوو، لێ بەلێ ئەو د هەمان وەخت دە وەك مەرڤەك ب كەرامەت، گەلەك خوەدێناس و مەرڤێ ب چیرۆك بوو ژی. ناڤێ شێخ ئادی یێ تەمام، شەرفەدین بن ئەبو ئەل-عەزائیل ئادی بن موسافیر بن ئیسمائیل بن موسا بن مەروان بن ئەل — هەسەن بن مەروان بوو.

رۆژ و ئاگر. د ئێزدیاتیێ دە، رۆژ و ئاگر، ئاڤ و هەوا ئەلەمەنتێن هەری موقەدەسن. ئێزدی ب حورمەتكاری رۆژێ د حەبینن و وێ وەكی چاڤكانیا ژیانێ دبینن" هەروها ئاگر داتینن و وێ وەكی خویابوونا رۆژێ ل سەر ئەردێ دبینن ئان كو وەكی هاتن و كفشبوونا رۆژێ ل سەر روویێ ئەردێ. دەما ئێزدی عیبادەتێ دكن لازمە بەرێ خوە بدنە رۆژێ كو ژ بەر ڤێ ڤاسێ گەلەك جاران "رۆژپەرست" ژ وان رە هاتیە گۆتن.

ئەڤ تایبەتیا ئێزدیان ئا خوەسەر د پێشیێ دە كر كو گەلەك زانیار بەحسا مانەندیێن دناڤبەرا زەردەشتی و ئێزدیاتیێ دە بكن. یا راست، تشتێن وەكی هەڤ ژ حەباندنا رۆژ و ئاگر گەلەك كوورترن.

وەك كو باش تێ زانین ئاین و باوەر (كوولن) د دین دە هشكتر ن ژ فكرێن دینی. د ئێزدیاتیێ دە ژ دەمێن كەڤنارە ڤە رێزگرتنا ل ئاگری هەر هەبوویە. دپرانیا جەژنێن ئێزدیان دە ئاگرەك تێ ڤێخستن ل لالشێ. هەر چەند ب لامپەیێن ئیكۆن ئان ژی ئاگرەكی ئاهەنگ و مەیدانێ بە ژی. ئاگر خوەدانێ رۆباكە پر مەزنە. ل ئێزدیان قەدەغەیە كو ئاگر پیس بكن. چ ب گۆتنان چ ب ئاوایەكی دن. جارانان ئێزدی وەك "ئاگر پەرست" هاتنە ب ناڤ كرن ژ بەر حورمەتا وان ئا بۆ

ئاگر، هەلبەت ئەڤ یەك نە راستە: گەلەك ملەتێن کەڤنارە ئاگر حەباندن، بۆ نموونە یۆنانی و رۆمایی ئاگر هەم وەکی ئاگرێ کوچکێ و هەم ژی وەکی هێزا کو ژیان ددا رۆژێ تەسەور دکرن.

مەراسیما ئینتیاسیۆنێ و نیشانا مەخسووس. نیشانێن ئێزدیان ئێن مەخسووس ب وان، کراسێ ب یەخەیا گلۆڤەر و **تۆکا ئێزید**ن کو ژ تۆکا ئێزید رە **گریڤان** ژی دبێژن.

فەقیر (دەروێشێن ئێزدیان)، خەرقەیێ ل خوە دکن و شریدەکە ژ هەری و هووناندی ب ناڤێ **مەفتوول** ب ستوویێ خوە ڤە دکن. فەقیر، شریدێ، ل دەوسا کراس ب **گریڤان** رە ب کار تینن" ژ بەر کو دڤێ ئەو خەرقەیێ راست ل سەر بەدەنێ خوە خوە ل خوە بکن. مەفتوولێ ژ ریسێن پەمبوویێ سپی دهوونن و فەقیر د ژیانا خوە دە تم ل خوە دکن. لێ ئەو تشت د ناڤ کوردێن ئەرمەنستانێ دە ژی هەبوون. ئیرۆ ئێزدی هێدی هێدی دەست ژ گەراندنا **تۆکا ئێزید** بەردن و ئەو عەدەت بێهتر دناڤ ئێزدیێن کو ل کوردستانا ئیراقێ دژین و دناڤ یێن سالمەزن دە تێ دیتن. ل ئەرمەنستانێ، هەتا سەرێ سەد سالا ٢٠ ئان، ئێزدیان شریدەکە هووناندی و ژ هری ب ناڤێ تۆکا ئێزید ب ستوویێن خوە ڤە دکرن و هەروها کراس ژی پێ رە ل خوە دکرن. جل و بەرگێن روحانیێن ئێزدی یێن لالشێ ژی دیسا **خەرقە** نە و "قووشاقا پیرۆز" کو ژێرە شوتك دبێژن.

مرۆڤ دکارە ئانالۆژیا ڤێ عەدەتێ د زەردەشتیێ دە ببینە لەورە باوەرمەندێن زەردەشتیێ **شوتکان** ژی شیردا پیرۆز، **ئاڤیاڼغانە**، ئان ژی **کوستیێ** ل خوە دکن هەر ل گەل کراسەکی سپی ب ناڤێ **ستەخر پایسەنغە** ("ستێرکان خێز کری") ئان ژی **سودرایێ** کو بەریکەکە سەمبۆلیك پێ ڤە هەیە ب ناڤێ گرێبان، و وەزیفەیا ڤێ بەریکا سەمبولیك ئەوە کو ب بیرا مرۆڤان بخە دا فکرا باش (**هومات**)، خەبەرێ باش (**هوخت**) و کریارا باش (**هوارشت**) هفز بکن. کوستی، کەمبەرا پیرۆز ئا پاراستنێ کو مرۆڤان دگهینە ئافرینەر، سێ جاران ل پشتێ و ل سەر کراس تێ گرێدان کو ب ڤی ئاوایی دشبە ئەخلاقێ رەسەن ئازەردەشتیێ یا فکرا باش، خەبەرێ باش و کریارا باش. هێژایی بەحسکرنێ یە، عەدەتەکە ئێزدیێن

ئەرمەنستانێ هەیە کو ل گۆری وێ عەدەتێ د دەواتێ دە بەری کو بووک ژ مالا باڤێ خوە بێ برن ب ئاوایەکی سەمبولیك شالەکە (شەعر) سۆر ئان ژی سپی (لێ ژ نیڤێ بێهتر سۆر) سێ جاران ل پشتا بووکێ تێ گرێدان و ڤەکرن. شال وەکی کەمبەرەکێ ل پشتێ تێ گرێدان.

کووستی[1] ژ ٧٢ تایێن (دەزی) هری ئان کو هندی هژمارا بەشێن "یاسنا" یێ[2] هووناندن. کتێب ژ ٧٢ بەشان پێك تێ کو ب زمانێ ئاڤەستایی ژ وان بەشان رە **خایێ** ئان ژی **خاتایی** دبێژن و دناڤ وان ٧٢ بەشان دە ١٧ گاتا ژی هەنە. گاتا شعرێن دینی نە و تێ باوەرکرن کو نڤیسکارێ وان زەردەشتە. هەژمارا ٧٢، خوەدانێ واتەیەکە سەمبۆلیکە بۆ ئێزدیان و د گەلەك دوعایێن وان دە، د پەسن و دوعایێن وان دە هەیە، بۆ نموونە: "برا خوەدێ بێ هاوارا هەفتێ دو ملەتا، پشتێ وەرە هەوارا ئێزدیخانە"[3] ئان "برا خوەدێ ریا هەفتێ دو ملەتا راست کە، پاشێ ریا ملەتێ مە." ب یا باوەریا ئێزدیان، ئێزدی پاشکەتیێن ئادەمن (کورێ وی شەهید ئیبن جەر)، و پشترە ٣٦ جێوی (٧٢ ملەت) ژ ئادەم و هەوا پاش کەتن، کو ژ وان هاتن ٧٢ ملەت.

ل ناڤ ئێزدیان، پرانی ل کوردستانا ئیراقێ، " مۆرکرن" ئان کو باپتیز، ب ئاڤا پیرۆزا کانیا سپی ل لالشێ تێ بجی ئینان.

د ناڤ ریتووەلێن ئینیتسیاتیۆنێ یێن ئێزدیان ئێن پر جهێرەنگ دە مەراسیما برینا پۆرێ یەکی ژی هەیە کو ئەو پۆر برین ژ ئالیێ **شێخێ بسکێ** ڤە تێ بجی ئینان.دایك و باڤ ، گازی ل **شێخێ بسکێ** دکن کو وەرە و بسکا لاوك ببرە کو پۆرێ وی ژ دایك بوونا وی ڤە مەخسووسەن قەت نەهاتیە برین. دناڤ ریتووەلێن

---

[1] دیارە کو عەدەتا پێڤەکرنا بەنێ ڤەگرتی د مەراسیما ئینیسیاسۆنێ دە وەکی یادگارەکە قەبوولبوونا بۆ جڤاکا دینی. عەدەتەکە ئیندۆ – ئیرانی یە. هەروها براهمانێن هندستانێ وێ ل دۆرا ملەکی خوە دگەرینن. ئەڤ شرید ژ سێ بەنان پێك تێ. هەر بەنەك ژ نەهـ دەزیان پێك تێ. زەردەشت ئەڤ عەدەتا کەڤن ئا ئیندۆ – ئیرانی هەلگرتییە ژ بۆ کو نیشانەکە مەخسووس بدە باوەرمەندان.

[2] یەك ژ کتێبێن ئاڤەستایێ. یاسنا ژ کۆکا ئاڤەستایی – یازێ – "پەرستن"، "حەباندن" تێ.

[3] ئێزدیخانە: جڤاکا ئێزدیان.

ئینیسیاتیۆنیێ یێن باوەرمەندێن دینیێ ڤێدا دە ژی کو ئاین و ریتووەلێن گەلەکی تێکەلن، مەراسیما پۆر برپینیێ (کەجانتا) هەیە، کو بەرۆڤاژی ئێزدیاتییێ ل گۆری دینیێ وان دڤیێ د عەمرەکی مەزنتر دە بێ بجی ئینان ئەڤ مەراسیم" بۆ نموونە، ژ بۆ براهمانان ١٦ سالی یە ئەو عەمر، ژ بۆ کشاتری ٢٢ سالی و ژ بۆ ڤایشایان دو سال پشت رە یە. مانەندیێن دناڤبەرا ئێزدیاتییێ، زەردەشتی و دینێن ڤێدا دە، ل سەر "rites de passage" و نیشانێن مەخسووس ئێن پەیرەوێن وان، دەلیلێن کۆکێن وان ئێن موشتەرەکن، ئان کو فکرێن دینێن ئیندۆ — ئیرانی.

**ئاوایێ جڤاکی.** ئێزدیاتی نە دینەکی میسیۆنەرییێ یە ژ بەر ڤێ هندێ ناهێلە ئالیگرێ باوەرمەندیەکە دن بێ و ببە ئێزدی. ئەڤ قەدەغە ژ پرەنسیبا دابەشبوونا ل گۆری کاستێن دینی تێ. ل گۆری ڤێ، جڤاکا ئێزدی، کو ژێ رە ***ئێزدیخانە*** دبێژن، دابەش بوویە دناڤ سێ کاستێن میراتی و ئەندۆگامۆس[1] دە: پیر، شێخ و مرید. هەر دوییێن پشتی روحانی نە و یا داوی بەس مرۆڤێن ئاسایی (مەعمولی)نە.

ژ ئالمێن دینیێ ئێزدیان رە ***تەریق*** دبێژن (ئێزدیێن ژ ئەرمەنستان، گورجستان و رووسیاییێ)، لێ هنەک تێرمێن دن ژی هەنە، ***روحانی و دوناڤ***، کو ب پرانی ژ ئالییێ ئێزدییێن ئیراق، سووریە و تورکیەیێ ڤە ژ بۆ ئالمتیا دینی تێنە بکار ئانین. ب ئیحتیمالەکە مەزن جڤاکا ئێزدی د ڤەگوهەرینەکە جدی رە دەرباس بوویە د سەدسالا ١٢ ئان دە، دەما شێخ ئادی ب. مووسافر پرانیا سیستەما دینیێ ئێزدیان رەفۆرمە کر. پرەنسیبا دابەشبوونیێ یە ل گۆری کاستێن دینی، دەلیلەکە ژ بۆ کۆکێن قەدیم ئێن ئیندۆ — ئیرانی یێن ئێزدیاتییێ.

**میرێ ئێزدی.** سەرۆکێ لایك و دینی یێ هەموو ئێزدیان ***میرە***. میر ل گوندێ باعەدرێ نێزیکی لالشێ ل هەرێما شێخان (ل کوردستانا ئیراقێ) دژیان. نها سەرۆکێ دینی یێ ئێزدیان میر تەحسین بەگە — کورێ سەعید بەگ. ئەو ژ کاستا شێخانە ژ مالباتا شێخووبەکر.

---

[1] ئەدەتێ کو تەنێ ژنێ ددە زەواجێن د ناڤ ئەینی کاستێ دە.

**هیەرارشیا سنفا روحانیان دناڤ ئێزدیان دە.** بابا شێخ، پێشیمام، شێخ ئـەل – وەزیر، بابا چاووش، بابا گاڤان، مجێور، فـەقرا و یـێن دن ژی دنـاڤ هیەرارشـیا روحانیان ئا ل لالشێ جی دگـرن. هـەروها قـەوال (بێـژەر و شـیرۆڤەکارێن باوەریا ئێزدیـاتیێ، کـو ب دەڤکـی ژ یـەکی دهاتـە ڤەگوهاسـتن بـۆ یـەکی دیـتر) و فـەقیر (رێبەرێن دینێ ئێزدیاتیێ) هەنە. فەقیر گەلەك رۆژیـان دگـرن، خەرقـەیان ل خـوە دکن، ل سەر نڤینێن رەق رادزێن، جخارەیێ ناکێشن، هتد.

**پێنج فەرز.** ل گۆری ***پێنج فـەرزان*** (پێـنج وەزیفـە، مەسـوولیەت) لازمـە پـیر، شێخ، هۆستا، مەرەبی و برێ \خوشکا ئاخرەتێ یێ هەر ئێزدیەکی\ێ هـەبن، یـێن نوونەرێن کاستێن روحانیان ژی.

**سەمبۆلیزما رەنگـان.** هنەك رەنگێن موهیم هەنە د داب و نەریتێن ئێزدیان دە کو ب پیرۆز تێنە حەسێبێ: سپی، سۆر و زەر. جـاران کەسـك ژی. رەنگـێ سـپی خوەدانێ جیەکی تایبەتە د ئێزدیاتیێ دە. لێ رەنگەکی دن هەیە، شینێ تاری، کو ئەڤ رەنگ ب ئاوایەکی جدی ل هەموو ئێزدیان قەدەغەیە و هنەك راڤە هەنـە ژ بـۆ ڤـێ قەدەغـەیێ. بۆ نموونـە، هنـەك لێکۆلینـەر وێ، وەکـی رێیاکسیۆنەکە ل دژی ئیسلامێ شیرۆڤە دکن، کو پەیرەوێن ئیسلامێ هەری زێـدە حـەز ژ رەنگـێ شـین و تـۆنێن وێ یـێن جهـێ دکـن. فکرەکـە دیـتر ژی هەیـە کـو دبێـژە د هنگامـا یـەك ژ کۆمکـوژیێن ل سـەر ئێزدیـان دە، رەنگـێ دژمنـێ وان شـینێ تـاری بوویـە. هنـەك نڤیسکار ئیددا دکن کو ئەڤ تـابوو تێکلـداری رەنگـێ شـینێ تـاووس، یـێ مەلـەکی تاووسە.

لێ بـەلێ ئـەز وسـا دفکـرم کـو رەنگـێ شـین و قەدەغـەیێن ب وێ، دبـە کـو دەلیلەکە دیتر ئا بنگەها قەدیم ئا ئێزدیاتیێ بە. هەکە ئەم بێهتر ب بالـداری ل ڤـێ تابوویێ بنێرن و بێهتر دێنا خوە بدنە رەنگی ب خـوە و پـەیڤا وێ نۆسـیۆنێ یـا د کوردی دە، هنگێ ئەم دکارن تێبگهن بێ سەبەبێ ئەسلێ ڤـێ قەدەغـەیێ چ یـە. د زمانێ کوردی دە، ئەو نۆسیۆنا "شینێ تاری" ب پەیڤا "***شین***"ێ تێ ئیفـادەکرن، کو واتەیا وێ یا دویێ "شین"، "تازی"، "ژان"ە. ل هندستانێ ژی، رەنگێ شینێ

تاری واتەیا "**شین**"ێ ددا. میستیسیزما ئیسلامیێ دە (سۆفیاتی)، **خەرقەیێن** گەلەك دەروێشان ب پرانی شین بوون كو "ژان" و "شین" سەمبۆلیزمە دكر. ل ئیرانا قەدیم، شینیێ تاری دهاتە واتەیا "شین"ێ (تازی، ماتەم). ئەم دكارن بگەهنە وێ قەنائەتێ كو دیارە قەدەغەیا ڤی رەنگی ل سەر ئێزدیان، دچە و دگهە فكرێن ئیندۆ – ئیرانی و بەرێ دهاتە واتەیا "ئێش و ژانێ".

كۆك و رەهێن ئێزدیاتییێ. دیرۆكناس و لێكۆلینەر هێژ نەگهیشتنە ئەنجامەكە تێر تەسەل دەرباریێ كۆك و رەهێن ئێزدیاتییێ دە. زانیاریێ فرانسی ر. لێسكۆ[1]، دكتێبا خوە دە كو ژ ئێزدیێن سوریەیێ رە تەرخان كریە، دبە دوو فكرا م.ئا. گودییێ لێكۆلینەریێ ئیسلامیێ، نڤیسەریێ هیپۆتەزا كۆكێن ئیسلامی یێن ئیسلامی. ب. نیكیتین[2] ڤێ فكریێ قەبوول ناكە و دیار دكە كو ئێزدیێن كورد قەت نەبوونە مسلمان. ب یا ن. ی. مار[3]، ئەندامیێ دائیمی یێ ئاكادەمیا زانستان، بەری كو ببن مسلمان پرانیا كوردان ئێزدی بوونە. هنەك لێكۆلینەر باوەرن كو دەستپێكا ئێزدیاتییێ تێكلداری جهووتی، باوەریێن پەرسیا قەدیم، خرستیانی و ئیسلامییێ یە. هنەكان گۆتیە كۆكا ئێزدیان دگهە ئەرەبان. فكرا هەری فانتاستیك یا نڤیسكارێن ئەرمەن ئێن سەدسالا ١٩ ئان بوو، ب یا وان ئێزدی كافرێن كو ژ دێرا ئەرمەنان قەتیایی بوون...

گەلەك راستیێن زمانی، دینی و دیرۆكی دهێلن كو ئەم ئیددا بكن كو نوونەرێن كولتورێن هندستانی و ئیرانی یێن كەڤن، د ناڤ یەك گروبێ دە بوون، ب ناڤێ خوە جڤاكا ئیندۆ – ئیرانی. گەلەك ئەلەمەنتێن مانەند ئێن دینێن ڤێدا، زەردەشتی،

---

[1] Lescot R. L'Enquete sur les Yesidis de Syrie et du Djebel Sindjar, "Memones de L'lnstitut Francaise de Damas. "Cild lV. Beyrouth. 1938.

[2] Nikitin V. Kurdy. Per. s frants. vstupitel'naya stat'ya i redaktsiya I. O. Farizova. Moskva, 1964. rp. 328.

[3] Marr N. Y. Eshye o slove "chelebi." K voprosu o Kultumom znachenii kurdskoy narodnosti v istoni Peredney Azii \\ZVOIRAO. T. XX. Sankt-Petreburg. 1911. rp. 99-151.

ئەهل–هەق و ئێزدیاتیێ دهێلن ئەم فەرز بکن کو بنگەهێن کو ئەڤ سیستەمێن دینی ل سەر هاتنە ئاڤاکرن، فکرێن ئیندۆ–ئیرانی یێن قەدیم بوون.

بێگومان مرۆڤ دکارە د ئێزدیاتیێ دە هنەك ئەلەمەنتان پەیدا بکە کو ژ دینێن دن مانە و د ئەنجاما تێکەهێن خارجی و دەرەنگ دە کەتنە ناڤ ئێزدیاتیێ. جارنان هەلوێست ئەوقاس جدی نابن د ناڤ ئێزدیان دە ل بەر مەفهوومێن خارجی یێن دەرەنگ، کو ئەو مەفهووم ئاشکەرا نە و خوەدان رێز و گرینگی نە" لێ تم و دایم پەیوەندی و هشیاریەکە تایبەت هەیە ل سەر کولتورا ترادیسیۆنەل.

د پرۆسەسا ڤەکۆلینا سیستەمێن دینی دە، هەروها ڤەکۆلینا کولتوری ب گشتی، لازمە هەبوونا دو تەبەقەیێن ژ عەسلێ خوە ڤە جهێ بێ پەیتاندن (کو ئەم وان ب ئاشکەرایی دبینن د ئێزدیاتیێ دە): تەبەقەیا ب ئالیێ دیرۆکێ ڤە پێشتر ("نزم")، کو ژ هێمانێن (پێکهێنەر) کولتوریێ یێن ژ رابۆریێ مایی پێك تێ" تەبەقەیا ب ئالیێ دیرۆکێ ڤە پاشتر ("بلند")، فێنۆمەنا نوو یا کولتوری و مۆدەرن ژی تێ دە. بنگەها دۆگما و ریتووەلێن دینی یێن ئێزدیان دکارە وەکی هێمانا پێشتر ئا کولتوریێ بێ حسێبکرن، کو بێشك، قاسی کو بێژی سابیتە ئەو. تەبەقەیا "نزم" ئا سیستەما دینی یە کو بارێ عەسلی رادگرە و بنگەها ئێزدیاتیێ یە.

بێگومان، کۆکێن ئێزدیاتیێ هەتا ناڤ کووراتیێن سەردەما ئانتیك و کەڤن دچن. د دینێ ئێزدیاتیێ دە، هەر ل گەل د دینێ کوردان ێ ئەهلی هەق، مرۆڤ دکارە باوەریێن هەری قەدیم ببینە کو کۆکێن وان د کووراهیا هەزارسالا بۆری دەنە. بنگەها ئێزدیاتیێ، کۆمبیناسیۆنەکە تێکەهێن هەری قەدیمە کو ئەو کۆمبیناسیۆن پڕ نێزیکی تێکەهێن ئیندۆ– ئاریانە. چەند نڤیسکاران ب ژ خوە باوەری نڤیساندنەکە کو ئێزدیاتی د سەدسالا ١٢ ئان دە بەلاڤ بوویە و دانەرێ وێ شێخ ئادی بن موسافر بوویە (یا راست، وی ئێزدیاتی نوو کریە). ئەو کەس، ژ بەر هنەك سەبەبان ئان ژی هەر ب قەستی چاڤێن خوە ل ئەو قاس ئەلەمەنێن قەدیم ئێن بێ هەژمارە و ئاشکەرا یێن د ئێزدیاتیێ دە دمقینن" نە تەنێ ل ئەلەمەنتێن د مەراسیمان دە لێ ل دۆگما، ئاین و ریتووەلان ژی، لەو وەك کو تێ زانین ئەو دۆگما و ئاین و ریتووەل دناڤ چەند هەزار سالان دە پێك هاتنە.

## جهوارێن ئێزدیان کۆچبەرێن جیهانێ

ناڤا چاڤکانیان دە د ناڤبەرا سەرهژمارا ئێزدیان دە گەلەک فەرق هەیە. سەدەما ڤێ یەکێ ئەوە، کو ل تو دەولەتان، دەربارێ هەژمارا ئێزدیان کو لێ دژین دە لێکۆلین نەهاتیە کرن و سەر هەژمارا وان نەهاتیە تەسبیت کرن. خێرنەخوازێن ئێزدیان هەر تم هەژمارا وان کێم کرنە و هندك نیشان دانە. ب تەخمینی، چاوا هنەك سەرۆکانی دنڤیسن و وسا ژی پێ گۆتنا هنەك دیرۆکناسێن ئێزدیان و کەسێن ئێزدی ئێن پسپۆر، هەژمارا ئێزدیان ل هەموو جیهانێ دگهیژە ملیۆنەکێ.

پرانیا ئێزدیان ب ئەسلێ خوە ل ئیراقێ ژیانە. ئەسلێ وان ژ سینجارێ ئانکو ژ چیایێ شنگالێ و دەڤەرا شێخان، وەلاتشێخێ تێ. گەلیێ لالش کو ل شێخانێ یە جهوارێ پیرۆزە زیارەتا هەموو ئێزدیانە و ب ناڤێ "لالشا نوورانی" تێ ناسین.

ناڤەندا دەڤەرا وەلاتشێخێ ژی (مەرگەها شێخان)، ئێسڤنێ یە. ئێزدی ل ئیراقێ، ل دەڤەرا وەلاتشێخێ، ل باژێر و گوندێن مینا: بابیرێ، باعەدرێ، باقەسر، بێبان، بێرستەك، بێتنار، بۆزان، جەروان، دێدەوان، دۆغاتا، ئێسیان، گابارە، گرێپان، گرخالس، حەسەنی، کەلەبەدرێ، کەڕان، مام رەشان، مەهەد، مەم شڤان، ملچەپەر، موقوبلە، مووسەکان، نسێری، رکاوە، قەندەل، قەباخ، قەسرئێزدین، سینا، سرێچکا، شاریا، تافتیا، خانك، خەتارێ، خەوشاڤا، خۆرزا، زەینیا و هتد دمینن.

ل شنگالێ نێزیکی سێزدە گوندێن ئێزدی یێن مەزن هەنە. ل باکوورێ شنگالێ ئێزدی ل گوندێن مینا: بارانە، جەفریێ، بەکران، بیردەهلی، بیر شیرین، جەفریان، ئالدینە، حەلێقی، کەرسی، مامیسێ پیردەهلی، سنوونی، تێرەف، وسفان، زێروان و هتد دژین.

ل باشوورێ شنگالێ ئێزدی ل گوندێن مینا" سکێنیا، مەجنوونیا، جەدالە، قەسەرکی، قزلکەند، تەپە حوسەینییە، کانی سەرەك، مەندکان، دالوکان و یێن ماین دمینن.

هەر وسا ئێزدی ل باشیقه و بەحزان، دهۆك و زاخۆیێ دژین.

هەر چەند سەر هژمارەکه دیار تونەبە ژی، دیسا تێ گۆتن کو دەردۆرا ٤٠٠ هەزار ئێزدی ل باشووریێ کوردستانێ دژین.

ئێزدیێن ل باکووریێ کوردستانێ ئانکو د ناڤبەرا سینورێن ترکیەیێ دە دژین ژی ل باتمان (ئێلـه)، تور– ئابدین، نسێبین، دیاربەکر، مێردین، وێران شار، سووروج و ل هن ناڤچەیێن سێرتێ دژین. لێ نها پرانیا وان کۆچی ئالمانیایێ بوونە و نها ل تورکیەیێ ئێزدی گەلەك کێم مانە.

هەژمارا ئێزدیان کو ل باژارێن کوردستانێ یێن کو د ناڤا سینورێن سووریەیێ دە دمینن ژی قاسی ٣٠ هەزار کەسی ئێزدی بوون و ل باژارێن وەکی" ئەفرین، قامشلۆ دژین. نها ژی ل سووریەیێ هەژمارا ئێزدیان کێمتر ژ ١٥ هەزاری یە. پرانیا وان ل ئەفرینێ و دەردۆرا وێ دژین و ل دەڤەرا جزیرێ دژین و نێزیکی ١٥ هەزار کەسی نە.

پر کێم ئێزدی ژی ل ئیرانێ دژین، ژ نیڤێ وان زێدەتر ل باکوریێ رۆژئاڤایێ ئیرانێ، ماکوو و خۆی، دژین و هەر وسا تێ گۆتن کو نێزیکی شەش گوندێن ئێزدی ل ئیرانێ هەنە و ناڤەندا وان گارمینە کو ل نێزیکی کێرمانشاهێ یە.

ئێزدی د ناڤا ئاخا کو ب تفاقا شێوریێ هاتیە دیارکرن دە دژین. پرانیا ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ ب ئەسلێ خوە ژ قەزایێن وەکی وان، قەرس و سورمەلیێ نە (ژ سەرحەدێ نە). سەرێ سەدسالا ٢٠ەمین ژ بەر زلما دەولەتا ئۆسمانیان[1] کۆچبەر بوونە.

ل دژی دژمناهی و خوینخواریا ل بەر خوە دانە، ب هێجەتا کو دژمنێن ئۆلی نەهاتنە قەتلکرن، ژ وارێن خوە هاتنە دەرخستن و ژ سەر ئاخا خوە کۆچبەر بوونە. دەست ژ واریێ کال – باڤێن خوە و ملکێ خوە بەردانە و کەتنە ریا مرنێ. گەلەك ژ وان هاتنە رۆژهلاتێ ئەرمەنستانێ و گورجستانێ و ل ور ب جی بوونە.

ب تەخمینی هەتا سالێن ١٩٩١ئان هەژمارا ئێزدیێن ل گورجستانێ دگهشتە هەتا ٧٠ هەزار کەسی. ل گورجستانێ پرانیا ئێزدیان ل باژارێن تبلیس، باتومی، رووستاڤی، تێلاڤی، کوتایسی (هندك) و هتد دمینن.

---

[1] کوردێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ دەولەتا ئۆسمانییان وەکی " رۆما رەش" ب ناڤ دکن.

ل ئەرمەنستانێ ژی بەریا هلوەشاندنا تفاقا شیۆرێ هەژمارا ئێزدیان نێزیکی ٩٠ هەزار مرۆڤی بوو و ئەڤ هەژمار ل گۆری ئیستاتیستیکێن فەرمی ژی هاتیە پشت راستکرن. هەتا سالێن ١٩٥٠ ئان ل ئەرمەنستانێ تەنێ ٣١ گوندێن خوەروو ئێزدی هەبوون. نها ژی ل ئەرمەنستانێ و ل گورجستانێ هەژمارا ئێزدیان قاسی دو قاتان کێمتر بوویە.

**قوبا ئێزدیان ل باشیك و بەحزانێ. کوردستانا ئیراقێ، ٢٠٠٦**

ئێزدیێن ئەرمەنستانێ ل باژار و نەحیێن وەکی ئابۆڤیان، ئاپاران، ئاراگاتس، ئارارات، ئارتاشات، ئاشتاراك، ڤێدی، ماسیس، نایری، ئۆکتێمبێریان، تالین و ئێچمیادزینێیێ دژین، پرانیا ئێزدیێن ئەرمەنستانێ ل باژارێ رەوانێ[1]، ئاخووریانێ، گومریێ (بەرێ لێنیناکان)، تاشیرێ (بەرێ کالینینۆ)، ئابۆڤیانێ، ئۆکتێمبێریانێ،

[1] یێریڤان.

ئێچمیادزینێ و سپیتاکێ دژین. ناڤا گوندێن ئەرمەنستانێ، کیدەرێ پرانیا ئەهلێ وان ئێزدی بوون ئەون:

**د نەحیا رماڤیرێ:** زارتۆنگ (١٣٠ مال)، ئەردەشەر (١٠٠ مال)، ئێخێگنووت (ناڤێ بەرێ مالە بەدر ٦٠ مال)، ئێرەسخاهوون (ناڤێ بەرێ قورو ئەرەز، ١٢٠ مال)، مێتس ئارماڤیر ناڤێ بەرێ ب قوردو قولی ٧٠ مال)، ساردارایات (ناڤێ بەرێ ئۆبتێمبێر ١٠٠ مال)، باژارێ ئارماڤیرێ ئۆکتێ مبێریان، ٦٥ مال)، زڤارتنۆتس (٦٠ مال) و هتد.

**د نەحیا ئاراگاتسۆتنێ:** بەررۆژ (ناڤێ بەرێ دووزکەند) تلك، مەككۆ، گەلتۆ، زربە، سابوونچی، قبختەپە، بایسز، قژلە مەعرا، قژلە سەیرانێ، کووسیا، کەلەکووتێ ژێرین، کەلەکووتێ ژۆرین، نازرڤان، کۆرپەلوو، ئەلەگەز (ناڤێ بەرێ جامووشڤانا مەزن، میرەکا چووك، میرەکا مەزن، قورووبوخاز، جەرجەریس، سیپان (ناڤێ بەرێ پامپ)، سەنگەر، پۆشت، ریا تەزە، شامیران، پیر مەلەك، و هتد.

**ژ نەحیا کۆتایکێ:** زۆڤوون (ناڤێ بەرێ گوندێ ئەمۆ — ١٠٠ مال) نۆر گێخی (ناڤێ بەرێ چەتقران ٥٠ مال)، پرۆشیان (٤٠ مال)، ئێلار و هتد.

ژ نەحیا ئاراراتێ: ئۆڤتاشات (ناڤێ بەرێ مێیماندەر ٢٥ مال)، باژار ماسیس (٢٥ — ٣٠ مال)، باژار یەریڤان (٣٠٠ مال).

پشتی تفاقا شێورێ رەوشا ئابۆری یا هەرێمێ خراب بوو و ژ بەر ڤێ یەکێ ژی ب تەخمینی نیڤێ ئێزدیان ژ ئەرمەنستانێ و گورجستانێ کۆچبەر بوون. چوونە وەلاتێن وەکی" رووسیا، ئۆکراینا، ئالمانیا، فرانسا، بێلچیکا، نیدێرلاند (هۆلەندا) و چەند وەلاتێن دن.

ل ئۆکراینایێ ئێزدی ل ڤان باژار و ناڤچەیان دژین.

**ژ نەحیا ئاکیمۆڤێ:** ل گوندێن ئاکیمۆڤکا، کیریللۆڤکا، رۆدییۆنۆڤکا، نەحیا دنێپراپێترۆڤسکێ: باژارێ دنێپراپێترۆڤسك و کریڤۆی رۆگ، گوندێن سۆفیگێ شیرۆکۆیێ، باژارێن زاپۆرۆژیێ و کیێڤ.

**ژ نەحیا کیرۆڤۆگرادێ:** باژارێن دۆلینسکایا و کیرۆڤۆگراد" قریمێ: باژارێن جانکۆیی، گوندێن ژیلینۆ، لۆبانۆڤۆ، باژارێن سیمفێرۆپۆل، مێلیتۆپۆل، نەحیا

پریازۆڤسك، باژارێن: خارکۆڤ، ژ نەحیا خێرسۆنیّ: باژارێن سکادۆڤسك، لازوورنۆییّ، خێرسۆن و هتد. (١,٨٠٠)" ڤۆلگۆگرادیّ (١,٥٠٠)" لیپێتسکیّ (١,٥٠٠)" ستاڤرۆپولیّ.

ئێزدیێن ل ورسێتیّ (رووسیا) ڤاسی ٧٠-٨٠ هەزارن. پرانیا وان ژی ل ڤان باژار و ناڤچەیێن ورسێتیّ (رووسیا) دمینن، وەکی پایێتەخت مۆسکۆ و ناڤچەیێن مۆسکۆییّ (ل باژارێن بالاشیخا، زێلێنۆگراد، لوبێرتسی، متیشیوا، ئۆدینتسوڤۆ، خیمکی، شیۆلکوڤۆ و هتد: ١٥,٥٠٠)" کراسنۆداریّ (ل باژارێن ئارماڤیر، ئادلێر، ئاناپا، کراسنۆدار، کرۆپۆتکین، نۆڤۆرۆسسیسك، سۆچی و هتد" ١٠,٠٠٠)" ناڤچەیا گۆرکی (ل باژارێن نیژنی نۆڤگۆرۆد، ئارزەماس، پێرێڤۆز و هتد" ٨,٠٠٠)" ناڤچەیا نۆڤۆسیبیرسکیّ (ل باژارێن نۆڤۆسیبیرسك و نەحیا" ٧,٢٥٠)" ناڤچەیا یارۆسلاڤلیّ ( ل باژارێن یارۆسلاڤلیّ، ریبینسك، تووتاییێڤ و نەحیا" ٥,٥٠٠) " ناڤچەیا تامبۆڤیّ ( ل باژارێن تامبۆڤ و نەحیا" ٣,٥٠٠)" ناڤچەیا ساراتۆڤیّ (ل باژارێن ساراتۆڤ، رتیشێڤ، ئێنگێلس و نەحیا" ٢,٥٠٠)" سڤەریلۆڤسکیّ (٢,٥٠٠)" رۆستۆڤیّ (١,٥٠٠" ساماریّ (١,٢٠٠)" ل باژاریّ سانت-پێترسبوورگیّ و ناڤچەیا لێنینگرادیّ (١,٢٠٠)" کوورسکیّ (١,٢٠٠)، ڤۆرۆنێژیّ (١,٠٠٠)، توولاییّ (١,٠٠٠)، تڤێریّ (١,٠٠٠)، تیوومێنیّ (٦٠٠)" ئیرکووتسکیّ (٥٥٠)" ئۆرێنبوورگیّ (٥٠٠)، جمهوریەتا وودموورتیا (٤٠٠)" جمهوریەتا تاتارستان (٤٠٠)" ئۆرلۆڤیّ (٤٠٠)" تۆمسکیّ (٤٠٠)" وولیانۆڤسکیّ (٣٠٠)" چێلیابینسکیّ (٢٥٠)، جمهوریەتا ساخا (ل باژاریّ یاکووتسکیّ (٢٥٠)" کالینینگرادیّ (٢٥٠)، کراسنۆیارسکیّ (٢٥٠)" بریانسکیّ (٢٠٠)، پریمۆرسکیّ ( ل باژاریّ ڤلادیڤۆستۆکیّ (١٧٥)" ئۆمسکیّ (١٥٠)" ئاستراخانیّ (١٣٠)" بێلگۆرۆدیّ (٨٠) و کیرۆڤیّ (٥٠).

پرانیا ئێزدیێن ئالمانیا ل باژارێن وسا دمینن، وەك تسێللیّ، باژارەکی پچووك ڤیتسیّ[1] ، بیلیفێلد، گیسسێن، برێمێن، ئۆلدئێنبوورگ، هانۆڤەر، کۆلن، ساربرووکێن (نێزیکیّ حودوودیّ فرانسیّ)، بەرلین، بۆن، فرانکفورت، فرایبورگ، موونشێن، هامبورگ، گۆتێنگێن، ئەینبێك (چەند مال) و هتد.

---

[1] دبێژن "Kleine Kurdistan"، یانی "کوردستانا پچووك."

گەلەك سازیێن ئێزدیان چاوا ل ئەورووپا، وسا ژی ل ورسێتیێ هاتنە چێکرن. مەسەلە، ئێزدی ل ئالمانیا (قاسی ٥٥ هەزار) ل باژارێن وەك بەرلین، هانوڤێر، گیسسێن ، ئۆلدئێنبوورگ، تسێللێ و هتد تەشکیلاتێن ئێزدیان ڤەکرنە. ئێزدیێن ورسێتیێ (٧٠–٨٠ هەزار) ژی ل باژارێ مۆسکۆییێ، کراسنۆداریێ، یارۆسلاڤلیێ، تامبۆڤیێ و هتد تەشکیلاتێن ئێزدیان ژی ڤەکرنە.

دەرگەهێ لالش، کوردستانا ئیراقیێ، ٢٠٠٦

## سیستەما ئۆجاخ، قەبیل و ئەشیرێن ئێزدیان:

# تێرمینۆلۆژیا وان

# (ل گەل لیستا ئۆجاخ و قەبیلێن شێخ، پیر و مریدێن ئێزدیان)

**دەستپێك**

ئێزدیاتی کو ب لیتەراتورا گشتی دە وەکی "Yezidism" ئان ژی "Yazidism" تێ ناسین، یەك ژ قەدیمترین دینێن کوردان ئێن یەك خوەدایی یە. ئێزدیاتی کو یەك ژ وان دینێن هەری سردار ئێن رۆژهلاتێ یە، خوەدی تایبەتیێن بنگەهین ئێن دینێن ناسکری یە، دۆگما، تەیۆلۆژی، مەراسیمێن دینی، ئایین و مەراسیمێن تێکەل و هییەرارشیا روحانیان. ئێزدیاتی، هەروها جوداهیی و پاکیا کاستان (تەبەقەیێن جڤاکی) ژی دپارێزە کو د راستیا خوە دە ئەو بنگەهێن جڤاکا دینی یا ئێزدیانە.

جڤاکێن دینی و نەتەوەیی، کو دوور و ڤەدەرن ژ کارتێکرنێن دینی و کولتوری و هەروها ژ بەر بێهتر خوەدی ترادیسیۆنێن دەڤکینە، بەری جاران ئورف و ئەدەت و باوەرییێن خوە باشتر دپارێزن ژ یێن دن، ژ ترادسیۆنێن نڤیسکی. فاکتۆرەکە دن ئا ل گەل ئێزدیان بۆ پاراستنا دینێ وان، هەرێمێن وان ئێن چیایی بوو کو ئەو تم فێری ژیانا لێ بووبوون.

ئێزدی پرانی ل ئیراقێ دژین و هەر وسا ژی ل سووریە، ئیران، ترکیەیێ، دەولەتێن سۆڤیەتا بەرێ، پرانی ل ئەرمەنستان و گورجستانێ ژی" پشکا بێهتر ئێزدییێن ل دەولەتێن سۆڤیەتا بەرێ د سەرێ سەد سالا بیستان دە ل ور ب جی بوون. تەنگاسییێن ئابۆری یێن دەما سۆڤیەتا بەرێ، کر کو هەژمارەکە زێدە یا ئێزدییێن ئەرمەنستان و گورجستانێ کۆچ بکنە رووسیایێ. ئێزدی نها ل ئۆکراینایێ ژی هەنە. گەلەك ئێزدیان کۆچ کرنە ئەورووپایێ ژی، ب تایبەتی بۆ ئالمانیا، ب

هـەژمارێن کـێمتر ل فەرەنـسا، بەلـچیکا، هۆلەنـدا، دەولـەتێن یـەکبوویی یـێن ئەمەریکایێ ، هتد دژین.

بازار و هەتا وەلاتێن جهێ یێن کو ئێزدی لێ دژین چقاس دوور بن ژی، هـەر ئێزدیەك ب راست و دورستی دزانە کا ژ کیژان کاست و قەبیلێ یە. بۆ هەر کەسێ/ا کو خوە وەکی یەك ژ جڤاکا ئێزدی دناسە، زانینا ناڤ و دیرۆکا ئەشیر و بابکا کـو ژێ یە، ئێرۆ ژی بێحەد موهیمە، ژ بەر کو ئەڤ زانین و زانیاری جیێ یەکی د جڤاکا ئێزدی دە دیار دکـە" هـەروها تێکلیـێن ل گـەل ئەنـدامێن ئێـل و قـەبیلێن دن ئـێن ئێزدی و ل گەل هنەك شەخسێن کو د ژیانا وی/وێ یا دینی دە گرنگن ژی دیسا ب ڤێ زانین و زانیاریێ دیار دبن. کـەس، ب ڤـێ زانینـێ بـەرێ خـوە دیـار دکـە دناڤ جڤاکا ئێزدیان دە و ئەرکێن خوە یێن دینی ب جی تینە.

دڤێ لێکۆلینێ دە ئەز دێ ستروکتوورا سیستەما قەبیل و ئێل ڤەکۆلم، کـو د ڤـەکۆلینا خـوە دە ئـەز دێ پرانیـا ب جڤاکـا ئێـزدیێن ئەرمەنـستان، گورجـستان، رووسـیا و ئوکراینـایێ رە مـژوول بـبم. هـەموو ئاگـاهیێن د ڤـێ گۆتـارێ دە تێنـە پێشکێشکرن، ژ ماتەریالێن ڤەکۆلینێن من ئێن قادێ نە کو من د ڤان سالێن داویی دە دناڤ ئێزدیێن ئەرمەنستان، گورجستان، رووسیا و ئوکرایینایێ دە کربوون. دڤـێ لێکۆلینێ دە گرنگیەکە تایبـەت ژی ل سـەر ڤـەکۆلینا کێشەیا بکارئانینـا تێـرمێن جهێ یێن ژ بۆ ئەشـیر و قـەبیلێن ئێـزدی هەیـە، ب تایبـەتی یێن ل ئەرمەنـستان، گورجستان، رووسیا، ل گەل هنەکێن ل ئیراق، ترکیە و سووریەیێ.

دڤێ لێکۆلینێ دە ئەز ئاگاهیێن کو مـن ژ لێکـۆلینێن خـوە یـێن ل سـەر چـار ئێلێن مەزن ئێن ئێزدیان جڤاندی ددم، کو ئەو ئێـل هـەتا سـەرێ سەدسـالا بـەرێ، دنـاڤ ئاخـا ئیمپاراتۆریـا ئۆسمـانی دە دژیـان و پـشترە ب دارێ زۆرێ هـاتن کۆچبارکرن بۆ ئاخا ئەرمەنستانا ئـیرۆ. ل ڤـر، نـاڤێن گونـدێن ئێـزدیێن هـەر ئێلـێ هاتنە دانان، گوندێن کو دەما دناڤ ئەردێ ئیمپاراتۆریا ئۆسمـانی دە بـوون تـێ دە دژین و پشترە ژێ کۆچ کرنە ئەرمەنستانێ و یێن هەتا ئیرۆ ژی لێ دژین.

ئەزێ تێگەهێن کاسی، قەبیل و مالێ راڤە بکم و هەروها تێگەها ئێلێ تایبەت د بارێ تێکلیا وێ تەڤ کاتەگۆریا کاستێ دە لێك بدم. پشتی، واتەیێن چاڤەرێ کری

ئێن ناڤێن هنەك قەبیلێن لێك بدم و داویی دێ خوە بدمە رۆلێن پێنج كەسێن كو هەر ئێزدیەك پێ رە دناڤ تێكلیەكە دیار و وەزیفەیێن هەڤپشك دەیە.

## سیستەما كاستێ

ئێزدیاتی نە دینەكی میسیۆنەرییێ یە: ب تەنێ ژ زایینێ مرۆڤ دكارە ببە ئەندامێ جڤاكا ئێزدی" تەڤاهیا جڤاكا ئێزدی ل سەر سیستەما كاستێ ئاڤایە، كو ڤێ سیستەمێ ستروكتوورەكە یەككرتی دایە جڤاكا ئێزدیان. هەموو ئێزدی ل ناڤ سێ كاستان دە دابەش دبن: پیر، شێخ و مرید. پیر و شێخ سنفێن روحانی نە، كو ئێزدیێن ئەرمەنستان و گورجستانێ ب گشتی ژێرە دبێژن"تەریق" ئان ژی "روحانی"، و نە ب قاسی یێن دن تێرما "دوناڤ" ژی ب كار تێ، لێ ئێزدیێن ئیراقێ پرانی"دوناڤ" دبێژن. ب چاڤدێرن من، وسا خویایە كو روحانیێن ئێزدی (پیر و شێخ)، نێزیكی ٦-٧٪ ێ هەژمارا گشتی یا ئێزدیان پێك تینن و ٩٣-٩٤٪ ئێن مایی مریدن.

ئێزدی ناسناڤێن گشتی و جەماوەری ب كار تینن ژ بۆ هەموو ئەندامێن هەر كاسەتەكێ. ئێزدیێن سۆڤیەتا بەرێ، ژ بۆ تەڤاهیا ئێزدیان تێرما ئێزدیخانەیێ ب كار تینن، ژ بۆ تەڤاهیا پیران پیرانی، ژ بۆ تەڤاهیا شێخان شێخانی و ژ بۆ تەڤاهیا مریدان مریدخانە دبێژن.

**قەبیلێن ئێزدیان**

هـەر کاسـتەك ژ ئـالیێ گەلـەك قـەبیلان تـێ تەمـسیلکرن. ب نـەریتی، چـل ئۆجاخێن شێخان و چل یێن پیران هەنـە. لێ بـەلێ دەمـا مـن لێکۆلینێن خـوە یـێن قادیێ دکرن، من نێزیکی ٩٠ ناڤێن مالێن پیران پەیداکرن.[1]

ئحتیمالەکە مەزن ژ بەر کو ئێزدی ل هـەرێم و وەلاتـێن جهـێ ب جـی بـوون و هـەر کـو دەم بـۆری ب ئـەنجاما جودابوونـا وان دە هـەژمارا قـەبیلان ژی زێـدەتر لێهات. جودابوون دناڤ مالباتـەکێ دە ژی چـێ دبـوو: هەکـە چـەند بـرا هەبوونـە د مالەکێ دە، هنگی چەند ژ وان بوونە ئاڤاکەرێ بەرەکێ (ژێر قـەبیل). بـۆ نموونـە، نها، هنەك مالێن پیران هەنـە، وەکـی پـیر ئۆمـەرخالی و پـیر هەسـەن چـنێری، کـو برایێن هەڤ بـوون (بنـر. "قـەولێ ئۆمـەرێ خـالا")[2]، ئـان ژی پـیر حـەجی مهەمـەد[3] (بێزورەت) و پـیر جـەروان، کـو ئـەو هـەردو ژی بـرایێن یـەك بـوون. ئێـزدیێن مـالا هەسەن چنێری جارنان ناڤێ مالا خوە ئان وەکی "هەسەن چنێری" ئان ژی وەکـی "ئۆمەرخالی" تینن. لێ بەلێ، ب نەریتی چل بابکێن پیر و شێخان هەنە، کو دبێژنـە مالێن وان "ئۆجاخ".

تێرمێن کو ژ بۆ کۆمێن پاترۆنیمیك (ناڤێ باڤی) ئـێن بنـەمالێن ئێزدیـان تێنـە بکارئانین، دبن بناسیێ هنەك تەڤلهەڤیان، کو هـەتا رادەیـەکێ ژ بـەر پەڤگوهـەرینا تێرمێن کوردی یێن دەرباریێ بابك و ئەشیران دەیە. لێ بەلێ، د ڤـر دە ئـەزێ هـەول بدم کو دیمەنەکە زەلال ئا بکارئانینا راسـتییا تێـرمێن جهـێ یـێن ل سـەر قـەبیلێن

---

[1] بۆ ناڤێن قەدەرێ ٢٠٠ مالێن شێخ، پیر و مریدان بنر. کتێبا Omarkhali, kh. 2005, (Yezidizm. Iz glubiny tysiacheletij. ئێزدیاتی ژ کوریبا هەزار سالان. سانکیت– پێترسبوورگ، رپ. ١٦٦–١٧٥.

[2] قەولێ ئۆمەرێ خالا " بنر. د ناڤ: رەشۆ. خەلیل جندی. ٢٠٠٤، پەرن ژ ئەدەبێ دینێ ئێزدیان. دهۆك. جلد. ١، رپ. ٥٣٥–٥٤٠.

[3] ناڤێ ئۆجاخا پیران ئا حەجی مەهەمەد "حەجی مەهەمەد بێزورەت"ە د ناڤ ئێزدیێن ئەرمەنستان و گورجستانێ دە. تو زورەت و پاشکەتییێن ژ ڤێ مالێ نینن ل ئەرمەنستان و گورجستانێ، لێ بەلێ ل ئیراقێ ل هەرێما شێخانێ هنەك ئێزدیێن ژ ڤێ مالا حەجی مەهەمەدی هەنە.

مرید و مالێن رووحانییێن ئێزدی یێن دناڤ ئێزدییێن ئەرمەنستان، گورجستان و رووسیایێ دە پێشکێش بکم.

### تیرمێن ل سەر قەبیلێن مریدان

ئێزدییێن ئەرمەنستان و گورجستانێ تێرمێ "بەرەك" و "قەبیل" ب واتەیا "قەبیلا مریدان" بکار تینن. د دیرۆکا ئێزدیان دە قەبیلێن مریدان ئێن ناڤدار هەنە، بۆ نموونە، ئانقۆسی، باراقی، داسنی، مامتاجی، ماسەکی، مەمرەشی، مەندکی، مەندەسۆری، میرئانگی، رەجەفی، رەشی، رۆژکی، ستورکی، شەرقی، شەمسکا، خالتی و گەلەکێن دن.

دیرۆکناسێ سەد سالا ١٦ئان شەرەفخان بدلیسی، د بەرهەما خوە یا بنگەهین ئا ل سەر دیرۆکا کوردان "شەرەفنامە" یێ دە، (بدلیسی ١٩٦٧، جلد ١: ٨٣) ناڤێن چەند ئەشیرێن ئێزدی تینە، وەکی " تاسنی"، "خالدی" و "دوومبوولی".[1]

ئێزدی، ڤێ تێرمێ د پرسێن خوە دە وها ب کار تینن: "تو چ قەبیلی؟" ("تو ژ کیژان قەبیلێی؟")، " تو چ بەرەکی؟" ("تو ژ کیژان بەرەکێی؟"). بەرسڤێن وان بۆ نموونە وها دبن:" ئەز رەشی مە"، ئان ژی" ئەز داسنی مە" و وها پێ دە. لێ بەلێ، ئێزدییێن ئیراق، سووریە و تورکیەیێ د پراکتیکێ دە ڤێ تێرما "قەبیل"ێ ب کار نائینن.

ئێزدییێن ئەرمەنستان و گورجستانێ، تێرما "بەر" ێ ژی کێم جاران وەکی هەڤتایێ "بەرەك" ێ بکار تینن. لێ بەلێ ئەڤ تێرم، بێهتر ژ ئالیێ ئێزدییێن ئەرمەنستانێ ڤە ب واتەیەکە دن، ب واتەیا "بابك"، "بنەمال"، یەك دکارە ببێژە ب واتەیا "ژێر بابك"ێ تێ ب کارئانین.

---

[1] شەرەفخان بدلیسی ل وێ دەرێ قەبیلەیێن دن ژی دبێژە: "باسییان"، "بۆختی" و "مەحمودی".

### تێرمێن کو ئۆجاخێن پیر و شێخان نیشان ددن

ژ بۆ پێناسەکرنا مالێن ژ کاستێن رووحانی (پیر و شێخان)، تێرمێن "مال" و "ئۆجاخ" تێنە بکارئانین.

کاستا پیران ژ ئالیێ گەلەک ئۆجاخان ڤە تێ تەمسیلکرن، بۆ نموونە، ئۆجاخێن پیر ئال، ئالوبەکر، باد، جەروان، زەرزا (ن)، هاجیال، هەسمەمان، ئیسیبیا، کەمالا، لبلان، مەمێ رەشان، مەقلەبێز، مەمێ شڤا (ن)، ئۆمەرخالی، قەدیبلبان، خانیا و هتد.

دەما ئێزدی دپرسن کا یەک ژ کیژان ئۆجاخێ یە، پرس وها یە "تو چ پیرانی؟" ("تو ژ کیژان ئۆجاخا پیرانی؟") و بەرسڤ دێ بۆ نموونە وها بە: "ئەز پیرێ ئیسیبیامە." ("ئەز ژ پیرێ ئیسیبیا مە")، ئان ژی " ئەز ئۆمەرخالی مە"، ئان ژی "ئەز پیرێ مەم شڤانا مە".

هەموو شێخ دناڤ سێ مالێن ئەندۆگامۆس دە دابەشکرینە: شەمسانی، ئادانی و قاتانی، هەر یەک ژێ ژی دناڤ مالێن دیتر دە دابەش دبە.

شەمسانی دابەش دبە دناڤ چار مالێن مەزن دە: شەمسەدین، فەخرەدین، ناسردین و سجادین، کو ئەو چار کورێن ئێزدینێ میرن. ژ بلی دویان، ناسردین و سجادین، ئەڤ هەموو مالێن بەحسکری دیسا دابەش دبن. بۆ نموونە، شێخێن شەمسەدین (دقەولان دە ناڤێ وی تەخەر وەکی شێشمس تێ زارکرن)، ب عەدەتی ژ ئالیێ نەه کور و سێ کەچێن وی تێنە تەمسیلکرن: شێخ خدرێ شەمسا، شێخ ئەڤدالێ شەمسا، ئامادینێ شەمسا، بابادینێ شەمسا، شێخ حەسەنێ شەمسا، شێخ باڤکێ شەمسا، شێخ تۆکلێ شەمسا، شێخ ئاڤیندێ (هەڤندێ) شەمسا، شێخ ئالێ شەمسا، ستیا ئیس (ئێس)، ستیا نسرەت، ستیا بلقان. ئۆجاخا شێخ رەش ژی (ئان ژی شێخ جنتەیار) کو دناڤ ئێزدیێن ئەرمەنستان و گورجستانێ دە یە ژ ڤێ مالێ یە.[1]

دەما ئێزدی دخوازن بزانن بێ کا یەک ژ کیژان ئۆجاخا شێخانە، ئەو پری جاران تێرمێن "مال" ئان ژی"ئۆجاخێ" بکار نائینن، وها دپرسن:" تو چ شێخانی؟" ("تو ژ کیژان شێخانی؟"). بەرسڤ دبە کو وها بە بۆ نموونە:" ئەز

---

[1] دەربارێ مالێن شێخان دە، بنر. کتێبا ئۆمەرخالی خ. ٢٠٠٥: ١٦٦–١٦٨.

شەمسانی مە، شێخێ ئامادینا مە"، ئان ژی " ئەز شێخووبەکرێ مە، شێخێ سۆرێ سۆرا مە".

پێدڤی یە ئەم ڤێ تێرما "ئۆجاخ"ێ ("کوچك"، "مال"، "مالبات–بنەمال")کو دناڤ جڤاکا ئێزدیان دە قەوی بەربەلاڤە راڤە بکن.

ئێزدیێن ئەرمەنستان و گورجستانێ ژ بۆ باڤ و کالان پەیڤا "جد"ێ بکار تینن. دناڤ ئێزدیان دە مەیلا حەباندنا ئاڤاکرێ "ئۆجاخ" هەیە. مزارگەه و جیێن پیرۆز هەنە ب ناڤێن شێخ و پیران، یێن ئاڤاکر ئان ژی شەخسیەتێن مەزنن ئێن مالەکێ، کو ژ ئالیێ حەجیێن ئێزدی ڤە پر ل ئیراقێ تێنە زیارەت کرن.

## تێگەهێن "قەبیل" و "ئێل"

ژ بۆ دیارکرنا تێگەها "قەبیل"ێ، ئێزدیێن ئیراق و سوریەیێ تێرما "ئەشیرێ"ێ و "ئێل"ێ بکار تینن. ژ ڤان یا یەکەم قەت و قەت دناڤ ئێزدیێن ئەرمەنستان، گورجستان و رووسیایێ دە نایێ بکارئانین و یا دویەم ب تەلافووزا ئێل و ب واتەیا "یەکیتیا قەبیلان"، "کۆنفەدەراسیۆنا قەبیلان" تێ بکارئانین.

ئێزدیێن ئیراقێ، "ئێل" ئان ژی "ئەشیر"ێ دناڤ "بابك" ئان ژی "بنەمال" ئان ژی "ئۆجاخ" دە دابەش دکن.

ئێل، ئەشیر

|

بابك= بنەمال

ئۆجاخ (٤٠ مالێن پیران و ٤٠ مالێن شێخان)

ئێزدیێن ئەرمەنستان، گورجستان، رووسیا و ئوکرانیایێ تیرمان وها بکار تینن:

ئێل

|

قەبیل، بابك (ژ بۆ مریدان)

مال، ئۆجاخ (ژ بۆ هەمی مالێن پیر و شێخان)

نە بەری ب دەمەکی درێژ، ئەندامبوونا ل ئێلەکێ، بۆ هەر ئێزدیەکێ/ی پر گرنگ بوو، ژ بەر کو ڤێ یەکێ هێمنتیا وی/وێ دیار دکر. تێکلداری ڤێ پەندێن ئێزدیان هەنە وەکی "قرا تەڤ ئێلێ دەواتە" ("مرنا ب ئێلێ رە قاسی دەواتێ خوەشە") ئان ژی "ئێل، ماکا مەریانە" ("ئێل دایکا مرۆڤانە").

ل گەل ئەندامبوونا ل کاستەکێ، ئێزدیێن کو ئیرۆ دناڤ ئەردێ ئێکەتیا سۆڤیەتان ئا بەرێ دە دژین، ئەندامێن یەك ژ چەند ئێلانن، واتە ئەندامێن یەك ژ ئێلێن زوقری، سیپکی، هەسنی[1]، ئۆرتلی، مەهمەدی نە. هێژایی گۆتنێ یە، ئێزدیێن ئێلا ئۆرتلیێ، کو ژ هەمی ئێلان ی‌ا هەری بچووکە، ب سەر ئێلا هەسنی ڤە دهێنە هژمارتن.

بالکێشە کو ئێزدیێن هەر ئێلێ، ب شێوەزارێن خوە ژ هەڤ تێنە ناسکرن" ب تایبەتی، شێوەزارێ ئێزدیێن ئێلێن هەسنی و مەهەمەدی جودایە ژ یێ ئێلێن زوقری و سیپکی. ئێزدیێن ژ ئێلا هەسنی، گەلەك جاران دەوسا "ب"یێ "ڤ"یێ تەلافز دکن، بۆ نموونە، دناڤ پەیڤان دە وها دبە: خەبەر/خەڤەر، خراب/خراڤ، سبە/سڤە، زەبەش/زەڤەش، حەساب/حەساڤ، خەبات/خەڤات و وها پێ‌دە. د تەلافوزا کوردیا ئێزدیێن ژ ئێلا مەهەمەدی، دەنگێ "ۆ" یێ بەربەلاڤە: "ئا" یێ ب ئاوایێ دەنگدێرەکە درێژ، نێزیکی "ۆ" یێ تەلافوز دکن.

ئەندامیا ل ئێلێ، هەر ل گەل ئەندامیا قەبیل یان ئۆجاخەکێ، ژ باڤ دەرباس دبە، نە ژ دایکێ. مەسەلە، هەکە دایك ژ ئێلا سیپکا و باڤ ژ زوقریا بە، زارۆکێن وان (چ کەچ چ کور) زوقری تێنە ناسین.

ب کوردی "کۆنفەدەراسیۆنا ئەشیران ئا زوقری" دبە "ئێلا زوقریا" و ئەندامیا ل وێ وها تێ گۆتن " ئەز زوقری مە"، ئان ژی "ئەز ژ ئێلا زوقریا مە." لەوما دەما ئێزدیەك دبێژە "ئەز زوقری مە"، یانی ئەو ژ ڤێ ئێلێ یە.

هەتا سەرێ سەد سالا بیستان، ئێزدیێن ژ ئەینی ئێلێ، ل سەر ئەینی ئەردێ دژین و هەر ئێلەکێ سەرۆکەکی ئەشیری هەبوو — ئاغا" وەکی کو ل ژۆر بەحس لێ بوو، فەرقێن دەڤۆکی یێن د ناڤبەرا وان دە هێژ ژی دیارن، و د هەر ئێلەکێ دە ئەندامێن کاستێن جهێ هەنە (پیر، شێخ و مرید). پشکا پتر ئێزدیێن د هەر ئێلەکێ

[1] د ناڤ ئەردێ ئیراقێ گوندەکی ئێزدیان یێ ب ناڤێ هەسنێ هەیە.

ده مریدن، لێ بەلێ پیر و شێخ ژی لێ هەنە و مومکونە کو ئەندامێن ئۆجاخێن وان پیر و شێخان د ناڤ ئێلێن دن دە ژی بن.

## ئێلا زوقریا

د ڤێ ئێلێ کو مرید و هەر وها شێخ و پیر تێ دە هەنە، قەبیلێن مریدان ئەڤن: بەراقی (بەعراقی)، بووتکی، بەلەکەری، داسنی (دەعسنی)، دڤنی، کۆرکتیا، ماسەکی، چۆخرەشی، مەمرەشی، مەندەسۆری، مەندکی[1]، رەشی، رەشکی، بەشەکە شەمسکا و یێن دن" ئۆجاخێن پیران ئێن وەکی ئۆمەرخالی، کەمالی، خانی و یێن دن" و مالێن شێخان ئێن وەکی شێخ مەند، شێخ سن و وها پێ دە هەنە.

جی و وارێن ئێلا زوقریا[2] ل قەزا وانێ بوون، ل سەر دەشتا ب ناڤێ دەشتا ئەبەخێ دناڤ ئەردێ ئیمپاراتۆریا ئۆسمانیان دە. ئەردێ د ناڤبەرا گۆلا وانێ، سینۆرێ ئیران و ئاڤا رەشێ دە، دەشتا ئەبەخێ یە. پرانیا خەلکێ زوقری ل دەڤەرا سەرەکانیا ئاڤا رەشێ، و سەدی هەشتێ ل بێرگریێ دژیان ل گەل هنەك کۆمێن ل هەرێمێن ئارچاق و تیرماران کو د ناڤبەرا گۆلا وانێ و بازارێ سەرایێ[3] دە شێنی بوون.

ئێزدیێن ژ ئێلا زوقری ل ڤان گوندێن قەزا وانێ دژیان، وەکی چبووخلی، چراخ، دێر جەمەدا ژێرین، دێر جەمەدا ژۆرین، دیزێ، گیهادین، هاجەلی، کانیسارك، کۆسە پشیکوومبەت، قزلاخ، قەلەجوخ، سەید ئاباد، سیمتاتۆس، شەمسەدین، شەنگلاڤە، شڤەکار، تیرکێشان، یارمقا[4]، ووتە، وەلیجان. من ناڤێن وان گوندان دان

---

[1] ل باشوورێ سنجارێ ل ئیراقێ، گوندەکی ب ناڤێ مەندکان هەیە کو ل وێ دەرێ ژی ئێزدیێن ل ڤێ بابکێ دژین.

[2] ژ بۆ ئاگاهیێن زێدەرتر ل سەر ئێلا زووقریا و ب تایبەتی جانگیر ئاغا بنێرە کتێبا ئەسکەرێ بۆییك (کو ب خوە نەڤیێ ئوسب بەگێ ئاغایێ ئێزدی یێ ئێلا هەسنی یە" دایکا وی گولیزەر، کەچا ئوسب بەگی بوو.) "ئێزدیاتی. میرزکێ زازا. فەرمانێن رەش." ئۆلدەنبۆرگ. ٢٠٠٦، رپ. ٢١٤-٢٦٠.

[3] ل گۆری پیر قاناتێ کاکێ، کو ژ ئێلا زووقریا یە (د ١٩٤٠ئان دە ل ئەرمەنستانێ ژ دایك بوویە).

[4] یارمقا جیێ بنەمالا سمۆیێ چەتۆ بوو.

یێن کو ب تەنێ ئێزدییێن ژ ئێلا زوقری لێ دژیان. ئێزدییێن ژ ئێلا زوقری ل گەل ئێزدییێن ژ ئێلێن دیتر ژی دژیان، هەر تەڤ ئەرمەنی، کوردێن مسلمان ئێن ل گوندێن وەکی ئاخوورێك، ئانگوورزەك، ئارچاك، بێرگری، ئەنزاڤ، ئەنزەل، گۆندوورمە، کۆرسۆت[1]، مووچێ، نانپارێز، خۆشاب، خرابە، تیمار.

ئەڤ ئێل، ئێلەکە هەر شەروود بوو، و تێ زانین کو وان کەلەهێن خوە هەبوون، بۆ نموونە، کەلا خۆشەبێ، کەلا سپی، کەلا رەش، ئال کەلە و یێن دن کو ژ بۆ پاراستنا ژ داگیرکەران ئاڤا کربوون.

د سالێن ١٩١٦ – ١٩١٧ ئان دە، ئێزدییێن ئێلا زوقریا، ب خورتی هاتن کۆچبەرکرن ژ وانێ بۆ دەڤەرا قەرسێ. ل ور، ل گوندێن دەڤەرا ب ناڤێ دەڤەرا چوخورێ جی ب جی بوون، کو ل وێ دەرێ ژ خوە ئێزدییێن ژ ئێلێن هەسنی و سیپکا هەبوون. ئەو گوند وها نە: بابخان، بزرخانە، گیادین، ئۆمەربەگ، پیر خالا، ساربەگلوو، سۆکتلی، تووتەك، ئولیکەند، زەریفخان و یێن دن.[2]

د ئەینی دەمێ دە (سالێن ١٩١٦– ١٩١٧ئان) جانگیر ئاغا تەڤ سەرۆکەکی ئێلا هەسنی ئوسب بەگ، ب قەهرەمانانە ل دژی ترکان شەر دکر د شەرێن نێزیکی قەرس و سورمەلیێ دە.

دەما ئێزدییێن زوقری هاتنەئەردێ ئەرمەنستانێ، ل هەرێما ئاشتاراکێ ل ئەنگەسەرکێ (نها ئەڤ گوند نەمایە)، ل ئیلانچالانێ، نەزرڤانێ، پێرسییێ (ئەڤ گوند ژی نەمایە) و پرۆشانێ ب جی بوون. ل هەرێما ئۆکتێمبێریانێ، ل بامباکاشات، پشاتاڤان، قاموشلی و قولیبەگلیێ ب جی بوون. ل هەرێما ئابۆڤیانێ: ئەشەرەباد (نها ئەڤ گوند نەمایە)، چاتقران. ل هەرێما تالینێ، ل کەلەشبەگێ، زربەیێ (نها ناڤێ ڤی گوندی کرنە سۆریك).

---

[1] ل گۆری کۆرسۆتێ ب تەنێ دو مالێن ئێزدییێن زووقریا و نێزیکی ١٩٨ مالێن ئەرمەنیان هەبوون، کو جانگیر ئاغایی ئەو د ژەنۆسیدا د سەرێ سەدسالا XX ئان دە خلاس کربوون. پاشکەتیێن ژ ڤان ئەرمەنیان نها ل کەڤەرا (گاڤار) ئەرمەنستانێ دژین.

[2] هەمی ناڤێن گوندێن ئێزدیان کو خەلکێ زووقریا لێ دژیان د ناڤ ئەردێن ئیمپاراتۆریا ئۆسمانیان و ئەرمەنستانێ دە، ژ ئالیێ پیر رزایێ کاکێ ڤە هاتنە نڤیساندن کو ئەو ب خوە ژی ژ ئێلا زووقریا یە.

سەرۆكێن ناڤدار ئێن ئـێلا زوقريـا، سمـۆيێ چـەتۆ و جـانگیر ئاغـا (جيهـانگیر ئاغا) بـوون. جـانگیر ئاغـا كـورێ خـەتيب ئاغـا بـوو و د ١٨٧٤ئـان دە، ل گونـدێ چيبووخليا دەڤەرا بێرگرییێ ژ دايك بوو بوو. جانگیر ئاغا ژ قەبيلا مەندكى يا كاستا مريدان بوو، كو ئەو ژى دناڤ ئێلا زقوريا دە يە. رۆلەكە پڕ موهيم ب جى ئانيبوو د شەرێ سارداراپاتێ دە (گولان ١٩١٨)، كو د ڤى شـەرێ ديارکـەر دە ئەرمـەنان ب ئاليكاريا هێزێن وى يێن دبن فەرماندارپا وى ب خوە دسـەركەفتن ب دەسـت خـوە ڤە ئانى بوو. ئەو بوو يێ كو ل گەل ئەسكەرێن خوە ئێزدى دپاراستن و مومكن كر كو ئەو و ئەرمەن رووبارێ ئەرەسێ بپەرن د هنگاما تەهجيرا وان ئا بۆ ئەرمەنستانا رۆژئاڤـا دە. جـانگیر ئاغـا د سـالا ١٩٤٣ئـان دە د گرتيخانـەيا رووسـان دە (ساراتۆڤێ) چوو رەحما خوەدێ.

جانگیر ئاغـا كـورێ خـەتيب ئاغـايێ كـورێ جـەنگۆ[1] ئاغـايێ (ئێزديـان ژێ رە مدوور ئاغا ژى دگۆت) كورێ بشار ئاغا بـوو. بـشار ئاغـا، ئـالى ميرزكـێ زازا كـر د شەرێن ل دژى تركان دە.

جانگیر ئاغا، د ١٩٠٣\٤ ئان دە قەهرەمانێ نەتەوەيى يێ ئەرمەنان ئاندرانيك ناس كر و د دەوەتا وى دە ئاندرانيك بوو "سەردەواتى"[2] يێ وى. ئەو د شـەرێن ل دژى تركان دە هەتا ١٩١٨ئان هەڤال بەند بوون.

---

[1] جەنگۆ كورتەيەكە ناڤێ جانگیرە.

[2] سەردەواتى ئەو كەسە كو د دەواتەكێ دە كاروبارێن دەواتێ ب جى تينە.

هەیکەلێ جانگیر ئاغا– سەرکارێ ئێلا زوقوریا ئەرمەنستان، یێریڤان. ٢٠٠٦

**ئێلا مەهەمدیا**

دڤێ ئێلێ دە قەبیلێن مریدان ئێن وەکی مەهەمەدی، هنەکێن مەمرەشا[1] و یێن دن هەنە. ئۆجاخێن شێخان ئێن وەکی هەموو شەمسانی، هەموو شێخ رەش (ژ مالا شەمسانیا) و شێخوبەکر هەنە. ئۆجاخێن پیران ژی مەمێ شڤان، خانی، قەدیبلبان و یێن دن.

خەلکێ ڤێ ئێلێ دبێژن کو ئەو د هنگاما شەرێ رووس و ترکان ێ سالا ١٨٢٨ئان دە رەڤیانە و د ئیرانێ رە کۆچ کرنە بۆ ئەردێ هەرێما ئاپارانێ، نها ل

[1] پرانیا وان دکەڤنە ناڤ ئێلا زووقریا.

ئەرمەنستانىّ. ئەو جارا يەكەم بوو كو ئەو دهاتنە سەر ئەردىّ ئەرمەنستانىّ. هنگىّ، گەلەك شێخ و پيرێن ژ ئێلا مەهمەدى ل گەل وان هاتن و ل گوندىّ ميرەكىّ هەرێما ئاپارانىّ[1] ئيرۆ ب جى بوون. ئەو ل هەرێما ئاراراتىّ، ل گوندىّ دەڤەليىّ ژى ب جى بوون.

ئێزدييێن ژ ئێلا مەهمەديا، ل دەشتا ئەبەخىّ ژى ( ل وانىّ) ب جى بوون، كو دكەتە رۆژئاڤايىّ خەلكىّ زوقريا.

سەرۆكىّ وان ئىّ ناڤدار كۆك ئاغا بوو، كورىّ مير چۆپان. ل گۆرى ريوايەتان، مير چۆپان ميرىّ ئەردەكىّ بوو كو ٣٦٠ گوندێن ل دەشتا ئەبەخىّ دبن حوكمىّ وى دە بوون.[2]

ل گۆرى ريوايەتێن ئێزديان، كەچەكە بەدەو هەبوو ب ناڤىّ زەريف خاتوون ژ مالا مير چۆپان. رۆژەكىّ، زەريف خاتوون ژ ئالىىّ كوردەكى مسلمان ڤە هاتبوو رەڤاندن. پشتى هنگى، دناڤبەرا ئێزدييێن ژ ڤىّ ئێلىّ و كوردێن مسلمان دە شەرەك قەومى يە، كو ئێزدى ژىّ رە دبێژن "شەرىّ زەريف خاتوونىّ." د ئەنجاما ڤى شەرى دە ٢٤٠ خۆرتێن ژ ڤىّ مالا ئێزدى هاتنە كوشتن. دبێژن كو هەموو خۆرت و پيرێن مالا مير چۆپان هاتبوون كوشتن. لىّ تەنىّ ژنەكە پێگران (دووجانى) كو ئەو ژى بووكا مالا مير چۆپان بوويە، خوە خلاس كرييە. ئەو ژن، كەچا ئووچ گەرۆ (ژ قەبيلا مەم رەشى يا ئێلا زوقرييا) بوويە. وىّ كورەك ئانييە دنيايىّ، ناڤىّ كۆك ئاغا[3] لىّ كرنە و پاشكەتيێن ژ وى، ئيدامە دانە ڤىّ ئێلىّ.

## ئێلا هەسنيا

دناڤ ئێلا هەسنيا دە ئەڤ قەبيلێن مريدان هەنە وەكى بەلەكەرى، بەياندوورى، بووڤكى، داسنى (دەعسنى)، داودى، دڤنى، دۆدكى، گێلۆيى، كاشاخى، مامتاجى، مەميدۆكى، مەخسوودى، موسكى، ميرانگى، قازانى، قووچى، رەموشى، شەرقى،

---

[1] ل گۆرى شێخ رحانا منەت، كو ژ ئێلا مەهمەدى يە (د ١٩٣٣ئان دە ل ئەرمەنستانىّ ژ دايك بوويە): و ل گۆرى پير رزايىّ كاكىّ.

[2] ل گۆرى شێخ رحانا منەت.

[3] و ل گۆرى پير رزايىّ كاكىّ شێخ رحانا منەت.

تووژکی، ئوودیٛ[1] و وها پیٛ دە. د ئیٛلا هەسنیا دە هنەك ئوٚجاخیٛن پیران ژی هەنە وەکی پیریٛ هەسن مەمان، پیریٛ ئوٚمەرخالی، و شیٛخان– شیٛخوبەکر. ئەندامیٛن هنەکیٛن ڤان ئوٚجاخان د ناڤ زوقریا دە ژی هەنە.

ئیٛزدیێن ئەرمەنستان و گورجستانیٛ دبیٛژن کو ئیٛلەکە دیتر هەیە، ب ناڤیٛ ئیٛلا ئوٚرتلیا. ب دیتنا من، ئەڤ ئیٛل، پارەکە ئیٛلا هەسنیایە. ئوٚرتلی کوٚمەکە بابکیٛن ژ هەمی کاستانە. سەعیدیٛ ئیبوٚ، د کتیٛبا خوە "کوردیٛ ریٛوی"[2] دنڤیسە کو ل پشت چیاییٛ گریداخیٛ، ئاراراتیٛ، گوندیٛ ئوٚرتل هەبوو. دبە کو ئەو جیەك بوو کو تیٛ دە گەلەك گوند هەبوون. خورتی ل وان هاتە کرن کو ویٛ دەریٛ بتەرکینن (بهیٛلن) و ئەو ژی ل دەڤەرا سورەمەلییٛ ب جی بوون. نڤیسکاریٛ کتیٛبیٛ د نڤیسە کو ناڤیٛ ڤی خەلکیٛ ل ویٛ دەریٛ دژی، ژ ناڤیٛ جییٛ ئوٚرتلیٛ تیٛ.

سەرۆکیٛ ئیٛلا هەسنیا، ئووسب بەگیٛ کوریٛ حەسەن بەگی بوو د سەدسالا ١٩– ٢٠ ئان دە. هیٛژایی گوٚتنیٛ یە، ئووسب بەگی پەروەردەیا بالا وەرگرتبوو، وی ئاکادەمی (خوەندنا بلند) ل ئیٛچمیادزنیٛ کوتا کربوو. ئەو ل گەل بەستەکاریٛ ناڤدار ئیٛ ئەرمەن کوٚمیتاس (سوٚگوٚموٚنیان) و کەرەمیٛ حەمید، کوریٛ بەگەکی کوردیٛ ژ بنەمالا ناڤدار ئا مالا کوٚسە گولی جواهر[3] – ئاغا، هین دبوو.

ئوسب بەگی نە تەنیٛ دناڤ ئیٛزدیان دە بەلکی دناڤ ئەرمەنیان دە ژی حورمەتەکە مەزن ددیت و ژ ١٩١٨ئان پیٛ دە وەکی نوونەرەکی جڤاکا ئیٛزدی هاتە هلبژارتن بوٚ پارلامەنتوٚیا کوٚمارا ئەرمەنستانیٛ. دهنگاما دەستدریٛژی و ئیٛریشیٛن ترکان ئیٛن سەر کوٚمارا ئەرمەنستانیٛ دە (د ١٩١٨ئان دە) و دیسا دەما پەنابەریٛن ئیٛزدی د هاتنە ئەرمەنستانیٛ، وی ب خوە د کار و هەولیٛن بجیکرنا وان و دابینکرنا تشتیٛن خوارنیٛ و پیٛدڤییٛن وان ئیٛن دیتر دە جی دگرت.[4]

---

[1] ل گوٚری پیر رزاییٛ کاکیٛ.

[2] سەعیدیٛ ئیبوٚ (١٩٧٩). کوردیٛ ریٛوی. ییٛریڤان، رپ. ٣.

[3] ل گوٚری پیر ڤاناتیٛ کاکیٛ.

[4] ل گوٚری پیر رزاییٛ کاکیٛ.

ئێزدیێن ژ ئێلێن هەسنی و سیپکا ل سەر هەمان ئەردێ دژیان، پرانی ل هەرێما قەرسێ، لێ بەلێ بەشەکە (پارەکە) وان ئا بچووك ژی ل هەرێمێن بازید و سورمەلیێ ب جی بوو بوون. (ناڤێن گوندێن کو ئەو لێ دژیان ل ژێرن).

هەیکەلێ مەزەلێ ئوسب بەگێ

ئەرمەنستان– شامیران.

خەلکێ هەسنیا ئێرۆ ل ئەرمەنستانێ، ل هەرێما ئاراراتێ ل گوندێ ئافشارێ دژین. ل هەرێما ئاشتاراکێ ل شامیرانێ" ل هەرێما ئۆکتێریانێ ل ئارماڤیر، بەدەل، ئەردەشیر، جانفیدان، مەلەبەدر، قورووەرەز، شاریار، ئوزوونۆڤ و ل یێن دن دژین. ل هەرێما ئارتاشاتێ ل جیێن وەکی ئارێڤشات و ئاینتابێ (ئێرۆ تەزەگویوخ) دژیان. ل هەرێما ئێچمیادزنێ ئێزدی ل ئەینەلی، ئەیارلی، قزلتەموور (ئێرۆ ناڤێ وێ کرنە ئاراگاتس)، تساخکوونك و زڤارتنۆتسێ دژیان. ل هەرێما ئابۆڤیانێ ل ئارینج، جێرڤێژ، گوندێ ئەعمۆ، موورەتەپە و قەرەقەلێ دژین. ل هەرێما تالنێ: ئاراگاتس، بەرۆژ، گەلتۆ، گێتاپ، هەکۆ، کاراکێرت، سابوونچی، تلك و قـژلا مەعرا. ل هەرێما ماسیسێ ل ماسیسێ دژین و دژیان.[1]

## ئێلا سیپکا

دناڤ ئێلا سیپکا دە ئەڤ قەبیلێن مریدان هەنە وەکی بەلی، چیلی، ئیسەدزی، کاشاخا، کارێیی، کلێری، مخایلا، پیڤازی، رەجەڤی (رەجەفی)، رۆژکی، ساحانیا، ستورکی، شانەزەرا، شەمسکا، ئووتی و وها پێ دە. وەکی ئۆجاخێن پیران، پیرێ باد، پیرێ قەدیبلبان، پیرێ مەمێ شڤان و یێن دن هەنە و وەکی شێخێن وان، شێخێن ژ مالێن شەمسانی و شێخوبەکرێ (قاتانی) نە.

ئێلا سیپکا دابەش بوو بوو دو کۆمان و سەرۆکێ کۆمەکێ ئەمەر ئاغا بوو. ئەو پرانی ل دەڤەرا دیگۆرا ل هەرێما قەرسێ دژیان. دیگۆرا ژێرین و دیگۆرا ژۆرین هەبوون. ئێزدیان ژ ڤێ دەڤەرا دیگۆرێ یا ئێزدینشین رە دگۆتن، "خەرەبێ دیگۆر." سەرۆکێن کۆما دن، کو ل گوندێن نەوالا سینەکێ[2] و دەروودۆرێن وێ دژیان، دو کورێن پۆلات بەگ، ئەلی ئاغا و ئەگیت ئاغا[3]، بوون.

---

[1] ل گۆری پیر رزایێ کاکێ و پیر قاناتێ کاکێ.
[2] سینەك کو ب کوردی وەکی "چۆلێ سینەکێ" ژی تێ بناڤکرن، نەواله.
[3] ل گۆری پیر رزایێ کاکێ.

ب یا ئێزدیان، پێشیێن ئێزدیێن ئێلا سیپکا یێن کو ل هەرێما سینەکێ دژیان و سەرۆکێن وان، کورێن پۆلات بەگێ بوون، ژ هەرێما موسلێ هاتبوون " د دەما خەزالیێ دە"[1].

هنەك ئێزدیان هینا ژی گۆتنێن دێ و باڤێن وان ل بیر تێن، کو دایباڤێن وان سەرهاتیێن ل سەر رابردوویا وان ئا دلسۆژ لێ قەرهەمانی دگۆتن ژ وان رە. ئاگەهدەریەکی من (پیر رزایێ کاکێ) ل بیر تێ کو دایکا وی، کو هەر ژ وێ ئێلێ بوو، ژێرە دیرۆکا ئێلا سیپکا کات دکر. وێ چیرۆکا هاتنا ئێزدیێن سیپکا بۆ ئەردێ ئەرمەنستانێ، کتە ب کتە ژێرە دگۆت.

پارەکە ئێزدیێن ژ ئێلا سیپکا، د ١٨٥٤–١٨٥٦ئان دە، د هنگاما شەرێ رووسیا و ئۆسمانیان دە هاتنە ئەردێ ئەرمەنستانا رۆژهلات و پرانی ل هەرێما ئاپارانێ ئیرۆ، کو هنگێ دناڤ رووسیایا تساری دە بوو، ب جی بوونە. پارەکە دنە ئێزدیێن ئێلا سیپکا د ١٨٧٧–١٨٧٨ئان دە د هنگاما شەرێ رووس و ترکان دە هاتنە. پارەکە مەزن ئا دیتر ژ ئێزدیێن سیپکا ژی، د هنگاما شەرێ جیهانێ یێ یەکەم دە هاتنە ڤان دەڤەران. لێ بەلێ، ل گۆری هنەك ریوایەتێن ئێزدیێن ڤێ ئێلێ، هنەك مالێن ئێزدیان هێ ژ سالێن ١٨٢٧– ١٨٢٨ئان ڤە ل ئەردێن ئەرمەنستانا رۆژهلات (ل هەرێمێن ئاپارانا ئیرۆ) دژیان.[2]

ئێزدیێن ژ ئێلا سیپکا و هەسنیا، ل هەمان هەرێمێ دژیان، پرانی ل هەرێما قەرسێ، لێ ل دەڤەرێن بازید و سورمەلیێ ژی ژ وان هەبوون. ل ڤان گوندان دژیان وەکی ئاکراك، ئالەم، ئەمەنچایر، ئەمەنکۆیی، ئێنگووك، ئێنیکێیی، ئەسلانیێ[3] (ل سورمەلیێ)، ئەیلا سنجۆ، ئەسمەر (ل بازیدێ)، باجەلی، بازارجوخ، باندەموراد، بادلی، دیگۆرا ئێزدیا، دیادین (ل بازیدێ)، دێریك، دیمسز، دووزگەچی (ل

---

[1] "غەزالیێ" وەختەکی نە دیارە، ب ئیهتیمالەکە مەزنە کو قەستا وێ دەما قەتلێن مەزن، زولم و رەڤینا، وەکی ئێزدی دبێژن، ژ هەرێما موسلێ دکە.

[2] ل گۆری پیر رزایێ کاکێ، کو قسەتێن دایکا وی گولیژەرا مەهمەد (ژ دایکبوون ١٩١٦) تێنە بیرا وی و کو دایکا وی ژێ رە قسەت دکریە کو باپیرەگەورێ وی ل گوندێ پامپا هەرێما ئاپارانسکیا ئیرۆ هاتنە دنیایێ. بابێ بابگەورێ وی هاتی بوویە ڤێ هەرێمێ.

[3] ئەسلانیێ گوندێ هەسەن ئاغایێ بابێ ئوسب بەگی، سەرۆکێ ئێلا هەسنیان بوو.

سورمەلیێ)، دوتاخ (ل بازیدێ)، گۆگەرمەس، گوندێ کەلۆ، گەرمەشڤ، گوندێ مەخسۆ، گوندێ شێخا، هۆجە قجلاخ، حەسەنجانۆ، کوندۆ، کووچە (ل سورەمەلیێ)، کۆسە سۆگتلی، قەرەلخ، قەزی کۆپلان (ل سورەمەلیێ)، قزلقول، قزلدز (ل بازیدێ)، قزنەفەر (ل سورەمەلیێ)، قەرەکۆز، قەرەقەلا ژۆر (قەرەقەلا بارۆ)، قەرەقەلا ژێر، قەرەکەند، قولپ (ل سورەمەلیێ)، قوبك، قزلجە، تەندوورەك، تاوشان، تاشنیکا ئێزدیا (تانیشکا چۆخرەشا)، تانیشکا کوردا، تاشکۆرپی، خوخان (ل بازیدێ)، مالا شەمدین (ل بازیدێ)، رەمەنقولی، ساریبلاخ، سیچان، سۆرخلی، سینەك، سووسز، شاترۆخلی، شیرینکو.[1]

دەڤەرا چوخریێ ئەو دەڤەرە ل هەرێما قەرسێ کو گوندێن سیپکی و هەسنیان لێ بوون و د ١٩١٧ئان دە ئێزدیێن ژ ئێلا زوقوریا هاتنێ و پرانی ل ڤان گوندێن وەکی بزرخانە، گیادین، پیرخالا، بابخان، ئمەر بەگ، سۆگتلی، تووتەك، ئوولیکەند، ساریبەگلوو، زەریف خانێ ب جی بوون.

دەما ئێزدیێن ل ئێلا سیپکا هاتنە ئەردێ ئەرمەنستانێ، ل ڤان گوندێن هەرێما ئاپارانێ ب جی بوون وەکی چۆبانماز، جاموشڤان (جاموشڤانا پچووك)، ئەلەگەز (جاموشڤانا مەزن)، گۆزەلدەرە، پۆشت، پامپ، جەرجەریس[2] (نها دێریك)، کۆربلاخ، میرەکا ژۆرین (پرانیا ئێزدیێن وێ دەرێ ژ ئێلا مەهەمدی نە)، میرەکا ژێرین، سەنگەر، قوروبۆخاز، قوندەساز. ئەو ل هەرێما ئێچمیادزنێ ژی ل گوندێن وەکی کۆرانلێ، کۆرپەلی، کوورەکەند، باگرامیان، نۆراکێرت و یێن دن دژیان و دژین. ل هەرێما تالنێ، ل گوندێن ئارتێنی، بایسز، سیچەنلی، قبختەپەیێ دژین.

---

[1] ل گۆری پیر رزایێ کاکێ. ژ بۆ ئاگاهیێن زێدەتر ل سەر ئەردێ کو ئێزدی ل ئیمپراتۆریا ئۆسمانیان لێ دژیان بنێرە: کەرەمێ ئانقۆسی. (٢٠٠٤)، ئێل و بەرەکێد کوردێد ئێزدی ل ڤاڤقازا باشوور و ئالمانیایێ. تبیلیسی، رپ. ٤٦-٥٢" وەزیرێ ئەشۆ (Rashidov V.A.). (١٩٨٩)، جاسمێ جەلیل. بژارە. یێریڤان، رپ. ٤" خەباتێن ئەرەبێ شەمۆ، حەجیێ جندی. د ڤان کتێبان دە یەك دکارە زێدەتر ناڤێن گوندێن ئێزدیان ل ناڤ ئەردێ ئیمپاراتۆریا ئۆسمانیان پەیدا بکە" من ب تەنێ ناڤێن گوندان دان یێن کو ئاگاهدەرێن ئێزدی دکاربوون ب بیر بینن و ب خوە ژ من رە بیێژن.

[2] هەیامەکێ جانگیر ئاغا ل ڤی گوندی ژیا پشتی ١٩١٨-١٩١٩ئان.

د سالێن ١٩٢٠ی دە، ژ بەر موشکولەیێن ئابۆری و هەژمارا زێدەیا پەنابەران ل ئەرمەنستانێ، هنەك ئێزدی چوونە گورجستانێ و ل ور ب جی بوون. ئەو ل ور ب جی بوون و نها ل بازارێن وەکی تبلیسییێ، کو قەدەرێ ٧٠٪یێ ئێزدییێن گورجستانێ لێ دژین، باتوومی، رووستاڤی، کووتایسی، تێلاڤی، گاردابانی، کۆبوولێتی و ل بازار و دەڤەرێن دن دژین.

## ئەشیرێن ئێزدیان ل ئیراقێ

گەلەك ئەشیرێن ئێزدی ل ناڤ ئەردێن ئیراق، تورکیە و سوریێ هەنە کو گەلەك ژ وان ئەشیران دناڤ ئێزدییێن ئەرمەنستان، گورجستان و رووسیایێ دە نایێن زانین. بالکێشە کو ئێلێن ئێزدی یێن ئەرمەنستان و گورجستانێ (زوقری، سیپکی، هەسنی و مەهەمدی) وەکی ئێل دناڤ ئێزدییێن ئیراق، تورکیە و سووریەیێ دە نایێن زانین.

ئاگاهدارییێن دەرهەقێ ئەشیرێن ئێزدی یێن ل ئیراقێ دە، ل هەڤپەیڤینێن ل گەل ئێزدییێن ژ ئیراقێ هاتنە بەرهەڤکرن کو نها هەر یەك ل وەلاتەکی جهێ یێ ئەورووپایێ دژی" هەروها د کتێبێن ج. ژ. ئێدمۆندس[1] و خ.ج. رەشۆ[2] دە ژی ئاگاهی هەنە دەرهەقێ ئەشیرێن ئێزدیان یێن ئیراقێ دە.

بەرەکەسێ ئێزدییێن ئەرمەنستانێ، ئەشیرێن ئێزدیان ئێن ل کوردستانا ئیراقێ ب گەلەك نێزیکی تێکلداری ئەردێ ئێکامەتا ئەشیرێ نە. ئێزدییێن ئیراقێ دابەش بوونە دناڤ دو کۆمێن مەزن دە: شێخانی و شنگالی (شنگاری). ئێزدییێن شنگالی ژی د ناڤ خوە دە دبن دو کۆم: جوانا و خۆرکانی کو ژ چەند ئەشیران پێك تێ.

[1] Edmonds C.J.A pilgrimage to Lalish. The Royal Asiatic Society of Great Britain and Ireland. 1967.

[2] Rashow Kh.J. An approach to the essence of Yezidian Religion. Uppsala, 1998.

ل شێخانێ ئەڤ ئەشیرێن ئێزدیان هەنە وەکی بەلەسنی، باسدکی، دنا، دوملی[1]، هەکاری، هەراقی، mامووسی، مووسانی، پێدایی، قائیدی، قرنایی، رووبەنیشتی، ترك، خالتی، خەتاری و یێن دن.

کۆما ئێزدییێن شنگالی ڤان ئەشیرێن هانێ دحەوینە: ئاقۆشی، بەکرا، چووکان، دلکان، ئەمەران، هەبابان (هەبابات)، هۆویری، حلێقی، هەسەکان(باکوری)، کزان، کۆرکۆرکی، مالا خالتێ (مسکۆرا، قیچکان، حەسەنی، نورکی، عەلدنان، ئوسڤان، خۆشی، عەلی سۆرکا، خفشان)، ماسەکی، مهرکان (مەهرکان)، خنان و یێن دن.

کۆما ئێزدییێن شنگالی ڤان ئەشیرێن هانێ دحەوینە: ئالدەخی، ئادیان، ئالدین، بەکران، جەفری (جەفریان)، چێلکا، چێلکان، دلکان، هەسکان (باشووری)، هەویری، هەلیقی (هەلەیقی)، کورکورکا (کۆرکۆرکا)، مەندکان، مووسانی، مەهرکان، موسقۆرا، مالا باکێ، قیچکان، قیرانی، رەشکان، سمووقی (سەمۆقا)، شرقان، شەرقیان، شەهوانی و یێن دن.

## ناڤێن قەبیل و ئۆجاخان: واتە و پەیوەندی یێن وان

نها ئەم بەرێ خوە بدنە ئالۆزییێن ناڤێن بابکێن ئێزدیان بۆ نموونە قەبیلا مریدان ئا خالتی، کو شەرەفخان بەدلیسی ژی بەحس لێ کریوو. ل ئیراقێ ئەڤ ئەشیر دابەش بوویە دناڤ هەفت بابکان دە: زرگانی، سروجی، خەندەقی، و هتد.[2] قەبیلەکە مریدان هەیە ب ناڤێ خالتی دناڤ ئێزدییێن ئەرمەنستان و گورجستانێ دە، کو ئەڤ بابك وەکی د میناکا ئێزدییێن ئیراقێ دە دابەش نەبوویە دناڤ ژێر- بابکان دە.

ل گەل کو پرانیا ئەشیرێن ئێزدی، ناڤێن خوە ژ ناڤێن پێشی (جد) ئان پێشەنگێن خوە دگرن، ناڤێن هنەکان ژی تەڤ ناڤێ جوگرافی گرێداینە. بۆ نموونە، قەبیلەکە مریدان ب ناڤێ کەندالی هەیە و ب هەمان ناڤی گوندەك ژی هەیە دکەڤە باشوورێ ئێسڤنێ

[1] شەرەفخان بدلیسی نە جارەکێ دنڤیسە دەرباری ڤێ ئێلێ دە د "شەرەفنامە"یێ دە. ئەو دنڤیسە کو میرێن ئەول ئێن ئەشیرا دومبولی، چوونە سەر دینەکی "مەزەبەکە ئادی یێ ئێزدیان" (بدلیسی ١٩٦٧: ٣٥٧).

[2] ل گۆری د. خ. ج. رەشۆ.

ل هەرێما شێخانێ ل کوردستانا ئیراقێ. دیسا قەبیلەکە مریدان ب ناڤێ مەمرەشی و گوندەکی ب هەمان ناڤی ل رۆژ هلاتی ئێسڤنێ هەیە (د ناڤبەرا ئێسڤنێ و گوندێ کەندالێ دە). بابکەك مریدان ب ناڤێ مووسکی هەیە و دیسا گوندێ مووسەکا هەیە ل نێزیکی چیایێ پیرۆزێ مەقلووبێ. مریدێن ڤێ قەبیلێ ل ئەرمەنستان، گورجستان و رووسیایێ و هەروها ل هەرێما سینجارێ ژی (شنگال) د ناڤ خەلکێ جوانا دە هەنە. دەما ژ هەرێما قەرسێ، ژ گوندێ زۆرێ و بازیدێ بارکرن، هنگی ل ئەرمەنستانێ خویابوون.[1]

هنەك ئۆجاخێن پیر و شێخان تێکلدارێ دیاردەیێن سروشتی نە. بۆ نموونە، پیر ئافات، ب لێسەر و تەرگێ (تەیرۆك) رە تێ تێکلدارکرن.

هەژمارەکە ئۆجاخێن پیر و شێخان ژی هەنە کو ل گۆری باوەرییێ تێکلییا وان ب با رە هەیە، لەورە با یەك ژ ئەلەمەنتێن سەرەکەیە: شێخ حەسەن (شێخسن)، شێخ مووسێ سۆر، پیر باد (ئان ژی جارنان بات). مەمێ رەشان، کو ناسناڤێ وی "شێر" بوو، خودانێ بارانێ و پشتەڤانێ ئەکنانە.

هنەك ئۆجاخێن پیر و شێخان مەخسووس ب هنەك حەیوانان رە تێنە تێکلدارکرن. بۆ نموونە، باوەری ئەوە کو شێخ مەند پشتەڤانێ مارانە، ئان ژی شێخ زەندین پشتەڤانێ کێڤرۆشکانە، وها پێ دە. بۆ نموونە، باوەری وسایە کو ئۆجاخێن پیران ئێن وەکی جەروان پشتەڤانێن دوپشکانن.

هنەك ئۆجاخێن پیر و شێخان ژی ب هنەك نەخوەشیا ڤە تێنە تێکلدارکرن، مەسەلەن، ئەو دکارن ئالی ساخکرنا نەخوەشییێ بکن. بۆ نموونە، شێخ جنتەییار و پیر قەدیبلبان و پیر هاجیال دکارن مرۆڤێن ب نەخوەشیا مێژی باش بکن. شێخ ئامادین دکارە زکێشیا زارۆکان پاك بکە (سانجوو برین) و وها پێ دە.

هنەك ناڤێن ئۆجاخێن پیران ژ ناڤێن پشتەڤانێن ئێزدی نە. بۆ نموونە، پیر مەمێ شڤان ژ ناڤێ مەمێ شڤان — خودانێ پەزی تێ. پیر گاڤانێ زەرزان ژی دیسا ناڤێ خوە ژ گاڤانێ زەرزانێ گرتیە کو خودانێ حەیوانێ مەزن (پێروو)ە.

مالا پیرێ لبنان ئالیکاریا مرۆڤێن نە زەوجی دکە (و کێ دخوازە بزەوجە). د جەژنا مەزن ئا خدر نەبی و خدر لیاس دە.ئێزدیێن ئەڤیندار ژ بۆ داوەت و

---

[1] ل گۆری پیر وەزیرێ کاکێ.

بەختیاریا خوە نیاز دکن ژ خدر نەبی و ژ لبنان. دبێژن کو لبنـان گەلـەك جیـوارێن حەجێ ئاڤا کرن و ژ بەر ڤێ هندێ ناسناڤێ وی "پیرێ پریکەتان"ە.

دناڤ ئێزدیـان دا ل سـەر نـاڤێن بابکـان ژی شـیرۆڤەیێن جهـێ هەنـە. تەخـەر، بیۆگرافیا شەخسێ دیرۆکی، یانی ئاڤاکـەرێ بـابکێ ب ئەفسانەیان تـێ مـەزنکرن. جارنان ئەڤ یەك ژ ئەتیمۆلۆژیا ئامیانە پێك تێ. ئەزێ ل ڤر بەحسا یەك ژ وان بکم دەرباری مالەکە پیران دە، واتە ئۆمەرخالا. ئێزدیێن ئەرمەنستانێ، ل گـەل گەلـەك چیرۆکێن جهێ، چیرۆکێن ئەتیمۆلۆژیا نەتەوەیی گۆتن ژ مـن رە دەربـارێ ئەسـلێ ڤی ناڤی دە: ل سەر روویێ ئاڤاکەری ڤێ ئۆجاخێ، ئۆمەر، خالەك هەبوویە، ژ بـەر ڤێ هندێ یە کو ناڤێ ئۆمەرێ خالا لێ هـاتبوو کـرن. لێ بـەلێ، ئـەو ژ مـالا خـوە رە تەخەر دبێژن "مالا باڤا".

ئۆجاخێن پیران ئێن ب ناڤێ هەسن مەمان ژی هەنە، لێ بەلێ دناڤ ئێزدیـان دە ئەو وەکی "پیرێ چل پیران" تێنە ناسین، ژ بەر کو ئەو وەکی پیرێن (بنر. ل ژێـری) ٤٠ ئۆجاخێن دن ئێن پیرانن.

ب ڤەکۆلینا لیتەراتوور و چاڤکانیێن دیرۆکنڤیسییێ یێن وەکی واکایینامەیان، یەك دکارە ببینە کو ناڤێ هەر مالەکێ تشتنان دبێژە دەربارێ دیرۆك و ئەسلێ وێ دە. ژێ پێ ڤە، هەژمارەکە ناڤێن بابکێن ئێزدیـان هەنـە کـو ئـەینی ئـەو نـاڤ دنـاڤ کـوردێن ژ دینـێن مـسلمان و ئـەهلی هـەق دە ژی هەنـە. بـۆ نموونـە، ئەشـیرەکە ئێزدیان هەیە ب ناڤێ دوملی و هەروها کـوردێن ئـەهلی– هـەق هەنـە کـو ژ ئـەینی ئەشیرێ (دملی) نە. ژێ پێ ڤە، قەبیلەکە مریدان هەیە ب ناڤێ شـکاکی و هـەروها ئەشیرەکە ناڤدار ئا کوردێن مسلمانان ژی هەیە دیسا ب ئەینی ناڤی.

گەلەك میناکێن ڤێ یەکێ هەنە کو ئەشیرەکە کوردان هەم ئێزدیاتی، هـەم ژی ئیسلام قەبوول کربن.[1] وەکی کو ل ژۆر بەحس لێ بوو، یەك ب زکماکی دبە ئێزدی، یەك نکارە ڤی دینی هەلبگرە، پشترە قەبوول بکە" ژێ پێ ڤە، دڤێ دابیاڤ هەردوو ژی ئێزدیێن ژ کاست و بابکێن کو زەواجا دناڤبەرا وان دە دورووستە بـن. ئـەڤ یـەك

---

[1] ژ بۆ ناڤێن ئەشیرێن کورد بنێرە کتێبا Lerkh, P. (1856). Issledoaniya ob iranskikh kurdakh I ikh predkakh severnykh khaldeyakh. Book I. Sankt-Pêtêrsbûrg.

دکاره وسا بێ شیرۆڤەکرن کو ئەڤ ئەشیرێن کوردان، بەری بەلاڤبوونا ئیسلامێ ئێزدی بوونه.

ل کوردستانا ئیراقێ، ئێزدی ل دهۆك، زاخۆ و دۆرووبەرێن وان دژین، و ژێ موهیمتر، ل دو هەرێمێن موهیم، شنگال (سنجار) و شێخانێ. ئێزدیێن ئیراقێ تەخەر ناڤێن گشتی ب کار تینن ژ بۆ دیارکرنا ئەسلێ ئێزدیان: وەلاتشێخی و شنگالی.

ئێزدیێن سنجارێ (شنگال) دناڤ خوه ده دابەش دبنه دو کۆمێن مەزن: جوانا و خۆرکانی. لێ بەلێ ئەو وەکی ئەشیر نابێن حسێبێ" ئەڤ ناڤکرنێن دەڤەرینه. ئێزدیێن باکورێ سنجارێ، جوانانه و یێن باشوور خۆرکانی نە. هەر یەکێ ڤان کۆمان ژی دابەش دبە چەند ئەشیران و ئەو ژی، دیسا دناڤ خوه ده دبن چەند بابك ئان ژی بەرەك.

## پێنج فەرز

خالەکه دن ئا گەلەکی موهیم هەیه بێ کو چما زانینا کاست، ئەشیر و بابکان بۆ هەر ئێزدی بێحەد گرینگه، تەمەن، زایند، کاست و ئیکامەت چ دبە بلا ببه.

بۆ هەر ئێزدیەك بێحەد موهیمه بزانه بێ کا کیژان کاست و قەبیلێ نە و مرۆڤ دکاره بێژه نها د سەدسالا ۲۱ئان دە، هێ زێدەتر موهیمه ژ بەر کو هەر ئێزدیەك، چ ژ سنفا رووحانی چ ژ مریدان، دڤێ پێنج فەرزان (نها ژی گەلەك جاران تەنێ سێ) ب جی بینه. ب خێرا فەرزان، کو هەموو پەیرەوێن دینێ ئێزدیاتیێ یەك دکه و دگهینه هەڤ، ستروکترا تەکانه یا جڤاکا ئێزدی پێك هاتیه.

بنیادێ ڤان پێنج فەرزان ئەوە کو دڤێ هەر ئێزدیەك پیر، شێخ، هۆستا (هۆستایێ رووحانی)، مەرەبی (مامۆستایێ رووحانی) و برێ ئاخرەتێ و/ ئان ژی خوشکا ئاخرەتێ هەبن ل گەل وەزیفەیێن وان ئێن دیار. یانی دڤێ هەر ئێزدیەك دڤێ دنیایێ دە ئەڤ پێنج کەس هەبن، کو تێکلیێن وان ئێن مانەوی ل گەل وی/وێ ئێزدی/ێ دیار و زەلالن. ژێ پێڤە، دڤێ ئەو ئیلاهی (خاس و چاك) و قانوونێن ئێزدیاتیێ فێری وی/وێ بکن، پێ بدن زانین کا چاوا حەرەکەت بکە دناڤ جڤاکا ئێزدیان دە. لێ ژ هەموویان گرنگتر، دڤێ ئەو، مەراسیمێن سەبارەت ب مەرهالەیێن

سەرەکە د ژیانا ئێزدیەکی/ێ دە (مەراسیما ئینیتاتۆنیێ\کەمالێ (بۆ نموونە: بسك برین" مۆرکرن، و هتد) مەراسیما جەنازەییێ (تەسلیمیێ ئەردێ کرن یان چالکرن)، و هتد) ب رێ ڤە ببە و بەشدارییێ لێ بکە.

دەما من هەڤپەیڤین دگەل ئێزدیێن ئەرمەنستانێ د ٢٠٠٥ئان دە چێکرن، گەلەك ئێزدیان بۆ پرسا "ب یا وە سیستەما کاستێ د ڤێ ب ئەینی ئاوایی دەوام ببە ئان نا؟"، بەرسڤا "ئەرێ" دان. دەلیلێ بنیاد کو ئێزدی نکارن بێیی سیستەما کاستێ بژین، هەبوونا پێنج فەرزانە، کو بێیی سیستەما کاستێ ئەو پێنج فەرز ب جی نایێن.

هەموو ئەندامێن کاستان دڤێ وەزیفەیێن خوە ب جی بینن: پیر، دڤێ ببە پیرێ "مریدێن خوە" شێخ، دڤێ ببە شێخێ "مریدێن" خوە. ئێزدیێن ئەرمەنستانێ ناڤکرنێن ل ژێر ب کار تینن بۆ وەجیبەیێن ئەندامێن هەر کاستەکێ:

یانی ئەرکا پیر، "پیرتی کرن"ە، یا شێخ، "شێختی کرن"ە. ژێ پێڤە، دیسا پێنج فەرز قەدەغەیێن ل سەر زەواجێن ئێزدیان دیار دکن تەنێ دناڤبەرا کاستان دە بەلکی د زەواجێن ناڤبەرا هنەك مالێن هەمان کاستێ دە ژی.

ئەرکێن سەرەکە یێن مەرەبی و هۆستایان، فێرکرنا ئەدەبیاتا دینی یا ئێزدیان، ئیلاهی و قانوونێن وانن. دناڤ ئێزدیێن ئەرمەنستانێ دە، شێخ، پیر، برێ ئاخرەتێ و یێن دن تەنێ دکارە ژ وێ مالێ بن یا کو ئەو ئێزدی دکارە ژێ هەلبژێرە، بۆ نموونە، شێخەکی مالا خوە.[1] مەسەلەن، شێخێن پیرێن ئۆمەرخالیا، شێخێن ژ مالا شێخ مەندن (ئەو ژ مالا فەخرەدینن، کو ئەو ژی د ناڤ بنەمالا شەمسانی دەیە). و ئەو نکارن ڤێ قائیدەیێ بگوهەرن، یانی رابن و شێخەکی ژ

---

[1] ژ بۆ ئاگاهیێن زێدەتر ل سەر تێکلیێن "پێنج فەرزان" و ل سەر ئەشیرێن ئێزدیێن ئیراقی بنر. د ناڤ: خ. ج. رەشۆ (١٩٩٨).

مالەکە دیتر هلبژێرن. پیرێ چل مالێن پیران، پیرێن ژ ئۆجاخا هەسمەمانن (پیرێ چل پیرا)، لەورا زەواجێن د ناڤبەرا ڤان ئۆجاخان دە قەدەغەنە.

هۆستا
مەرەبی
برێ/ خوشکا ئاخرەتێ

هەر ئێزدیەك دڤێ شەدەتیا دین (ئان ژی شەهدا دین) بزانە، کو د وێ شەدەتیێ دە هنەك رێز هەنە کو دڤێ ئێزدی ناڤێن هەموو مالێن مرۆڤێن ژ پێنج فەرزێن خوە بینە.

## ئەنجام

بابکێن ئێزدی نەبوونە مالێ زەمانێن بەرێ، لێ بەرەڤاژی ڤێ، نها ژی ل کارن و جیێ ئێزدیەك دناڤ جڤاکێ دە ب ئاوایەکی زەلال و تەقەز دیار دکن. جڤاکا ئێزدیان نە تەنێ سیستەمەکە تێکەلە، کو بنگەها وێ دابەشبوونەکە ل گۆری کاست و دینی یە، بەلکو سیستەمەکە کو ل سەر پێنج فەرزان ئاڤایە: و د بنگەها هەموویان دە زانینا ئەشیرێن ئێزدیان هەیە.

**ئیلاوه: لیستا قەبیل و ئۆجاخێن ئێزدیان**

شێخانی: ئادانی، قاتانی، شەمسانی

پیرانی

مریدخانه

**شێخانی**

**١- ئادانی**

شێخ سن/ شێخ حەسەن

شێخ شەرفەدین

شێخ زێندین

شێخ براهیمێ خەتمی

شێخ مووسێ سۆر

شێخێ ئێتیما

ستیا گول

**٢- قاتانی**

شێخووبەکر/شێخ ئابوو بەکر

شێخ مەهەمەدێ باتنی

شێخ ئیسماعیلێ عەنزەلی

شێخ عەبدولقادر

شێخ ماڤیێ زار

شێخ کارا

شێخ خەلیفەتا

شێخ سۆرێ سۆرا

**٣- شەمسانی**

شێشمس/ شێخ شەمس ئێد — دین.

فەخەردەین/ فەخر ئێد — دین.

سجادین/ سجا ئێد — دین.

ناسردین/ ناسر ئێد — دین.

**٣-١- شێشمس/ شێخ شەمس ئێد -دین**

شێخ خدرێ شەمسا

شێخ عەڤدالێ شەمسا

ئامادینێ شەمسا

بابادینێ شەمسا

شێخ حەسەنێ شەمسا

شێخ باڤکێ شەمسا

شێخ تۆکلێ شەمسا

شێخ ئاڤیندێ شەمسا

شێخ ئالێ شەمسا

شێخێ رەش/ شێخێ جنتەیار

ستیا ئیس/ ئێس

ستیا نسرەت

ستیا بلغان/ بەلقان

**٣-٢- فەخرەدین/ فەخر ئێد — دین**

شێخ مەندێ فەخرا

خاتوونا فەخرا

شێخ بەدر

**٣-٣- سجادین/ سجا ئێد — دین**

**٣-٤- ناسردین/ ناسر ئێد — دین**

پیرانی
ئال
ئالووبەکر/ ئالۆبەکر
ئافا
ئاتقاتێ
ئاخا
باد/ بات
بازید
بەعری
بەیبوون
بوال
بوو
بووب/بۆب
بووك
بۆز/ بووز
جەرڤا(ن)/جەروان/جەبران/جەرڤا
چاك
چێلێ
داڤوودی/داودی بن دەرمان
دەڤا
دربێس/ دەربس
دەلی
ئەڤدیا
ئێزید
فات
گاڤانێ زەرزان
گەرگەر

هاجخال

هەمەل

هەسمەمان/ هەسەن مەمان/ پیریٚ چل پیرا

حەجی مەهەمەد بێزورەت

حەجی عەلی/ حەجی عەلی مەمین

هەسەن

هەسەن چیناری/ هەسەن چنێری

هەسەن دەقیق

هەسەن چکێر

هەسەن تەلك

هەسین پیر

هەسین شیرین

هەسەنەناك/ هەسلەماك/ هەسلەناك

هاجیال

هەسنالکا/ هەسەن ئێلکا

هەمەدیٚ بابیٚ

هێسم

هوو

ئیس

ئیسیبیا/ ئێسیبیا

کەوکی

کەمالا

لبلان/ لبنا

لووفی

مەمیٚ رەشان/ مەهمەدیٚ رەشان

مەقلەبێز/ مەلقەبێز

مەمیٚ شقان

مالا بالا
مەهبووف/ مەبووب
موس/ مۆسیٚ
مەهمەدیٚ رەبەن
مەن
مەند
مەرڤان/مەروان
مەحموود
مەهەد یەشان
مەیسوور
مەنسوور
مۆمن
ناڤدار
ئۆمەرخالی/ ئۆمەریٚ خالا
قەدیبلبان
قەرەچەر
قەلەندەر
قلیٚچ
رەشید میٚراڤیٚ
رەشیٚ حەیران
سباتیٚ/ سبا
سین خالی
سینان ئەزار
سنیبالیٚ/ سنیبەری
شامیا
شالیار
تەرجمان

تووز

تووسکی

خەمسی

خانیا

خەفووف

خۆشاڤا/ خۆش ئافا

خەتی پسی

زەکر/ زکر

**مریدخانه**

ئانقۆسی

باراڤی/بەراڤی

بەلی/بەلا

بەلەکەری

بەیان دووری

بوودی

بووتکی

بووڤکی

جەلۆی

چۆخ رەشی/ چۆ رەشی

چیلی

چلدەر گووشی

دەسنی

دڤنی

دۆدکی

گا بەلەکی

گەردەن زەری

گێلۆیی
ئیسەدزا
کەندالی
کۆرکۆتی
کورتکی
کاشاخا
کلێری
مامۆیی
مام تاجی
ماسەکی
مەمەشەریف
مەم رەشی
مەمکی
مەمیدۆکی/مەموودۆکی
مەندکی
مەندەسۆری
مەخسوودی
مهەمەدی/ مەهمەدی
مهێلی
مخائیلی
میرانگی
مووسانی
مووسکی
ئۆزمانسوویی/ ئۆزمانسۆی
پیڤازی
قەرێی
قووچی

قازانی
رەشی
رەشکی
رەجەفی/رەجەڤی
رەمۆشی
رەش کۆت
رۆژکی
ستورکی
ساهانی
سەلوانی
شکاکی
شەرقی
شەمسکا
شەمەزەرین
شاهنەزەری
تووژکی
تۆرنی
ئودی
ئوتی/وتی
خالتی
وەلۆی

## ئەشیرێن ئێزدیان ل شنگالێ

١- خۆرکان
ئالدەخی
ئادیان

ئالدین
بەکران
جەفری/ جەفریان
چێلکا
چێلکان
دلکان
هەسکان– شەرقان
هەویری
حەلیقی/ حەلەقی
کورکورکا/ کۆرکۆرکا
مەندکان
مووسانی
مەهرکان
موسقۆرا
مالا باکێ
قیچکان
قیرانی
رەشکان
سمووقی / سەمۆقا
شرقان
شەرقیان
شەهوانی

٢– جوانا
ئاقۆشی
بەکرا
چووکان

دلکان
عەمەران
هەبابان/ هەبابات
هۆوێری
حلێقی
هەسکان – شمال
کزان
کۆرکۆرکی
ماسەکی
مهرکان/ مەهرکان
خنان

**مالا خالتیٚ**

مسکۆرا
قیچکان
هەسەنی
نوکری
ئەلدنان
ئوسڤان
خۆشی
عەلی سۆرکا
خفشان

**ئەشیرێن ئێزدیان ل شێخانیٚ**

بەلەسنی
باسدکی
بریمەنی

دنا

دوملی

هەکاری

حەراقی

مامووسی

مسووسانی

پێدایی

قائیدی

قرنایی

رووبانیشتی/ رووبەنیشتی

ترك

خالتی

خەتاری

**بیبلیۆگرافیا**


– بدلیسی، شەرەفخان ئبن شەمسەددین (۱۹٦۷). شەرەف – نامێ. ژ ئالیێ E.I.Vasiljeva ڤە هاتیە وەرگەراندن بۆ رووسییێ. مۆسکڤا، پ پ ڤ، جلد.۱.

– Edmonds C.J. A pilgrimage to Lalish. The Royal Asiatic Society of Great Britain and Ireland. 1967.

– رەشۆ، خ. ج. (۲۰۰٤)، پەرن ژ ئەدەبێ دینێ ئێزدیان. دهۆك. جلد.۱، ۲.

– خلیل جندی، نحو معرفه حقیقه الدیانه الایزیدیه. السوید ۱۹۹۸.

## سەمبۆلیزما تەیران د ئێزدیاتییێ دە

فکر، تەیرا هەری بلەزە.
ریگڤێدا

### دەستپێك

سەمبۆل ئیماژەکە کو تم واتەیەکە وێ یا دیار هەیە. سەمبۆلا کو ب وی ئاوای تشتەکی و واتەیەکێ ب هەڤ ڤە تێکلدار دکە، هەڤکات مرۆڤان ژی تێکلدار دکە، مرۆڤێن کو وێ تێدگهن" لەوما ئەو ئاوایەکی ڤەگوهەستنا زانیارییێن دیارە (گەلەك جاران زانیارییێن پیرۆز).

دترادیسیۆنێن میتۆپۆەتیك ئێن جهێ دە، تەیر، ئەلەمەنتێن بنگەهینە ژ بۆ سیستەمێن دینی– میتۆلۆژیك و ئاینانن" گەلەك فۆنکسینێن وان ئێن جهێ هەنە. دگەلەك سیستەمێن تەسەوورێن دینی و میتۆلۆژیك دە تەیر، ئیماژێن سەمبۆلیکن" بۆ نموونە سەمبۆلێن خوەدایان و دکارن سەمبۆلێن خاس و بابچاك بن، ئان ژی یێن دێموورگۆسن (ئافرینەرێ کایناتێ)، ئەگیت و قەهرەمانان، هتد. وەکی سەمبۆلێن جەوهەرێ خوەدایی، ئەسمان، رۆژ، برووسك، با، هتد ن. تەیر، سەمبۆلا ئازادیا تەمام، بەرزیا روح و ئازادیا روحانی یە. لەوما سەمبۆلا تەیرێ، تێکلدارە ل گەل خوەدایی، جاویدانی و هەروها ل گەل سەرکەتنا روحانیێ .(Waida 1987)

د سەمبۆلیزم و میتۆلۆژییێ دە ب گشتی واتەیەکە ئەرێنی یا تەیران هەیە. د هنەك سیستەمێن میتۆلۆژیك دە تەیر سەمبۆلێن روحێن مرۆڤانن" کۆما دن ئا سەمبۆلان ل سەر وێ فکرێ ئاڤا بوویە کو تێکلیا تەیران ل گەل تەبەقەیێن خوەدایی هەیە. سەمبۆلا تەیر–روح پر قەدیمە" جارا ئەول ل نیگارێن شکەفتان ئێن دۆردۆنەیێ هاتیە پەیدا کرن، کو دگهە رابردوویەکە هەڤدەه هەزار سالی.

**ئامانەکە زێرین ئا پان (سەدسالا ٥ – ٦ ب.ن) ژ هەمەدانێ، ب شکلێ تەیرەکی دفرە د ناڤ دە، تەیرێن مانەند ژ تشت و ئامانێن زیڤین ژی تێنە زانین و هەروها د هونەرا سکیتیایان دە ژی بەربەلاڤن. نیو–یۆرك.**

هەروەها، ب تایبەتی هونەرا گەلێن ئیرانی زەنگینا "سەمبۆلیزما تەیرانە": کافی یە کو ب تەنێ رۆلێن جهێ یێن گەورە تەیرا سیمرێ د دەستانا شاهنامەیێ دە و د شعرا سۆفی یا ئاتتار، "منطق الطير" (١١٧٧) دە ب بیر بێن (بەرتەلەس ١٩٩٧: ١٥٥).

تێ زانین کو شامان هەتا نها ژی جل و بەرگێن خوە ب پەڕان دخەملینن و د هنگاما ئاینان دە ماسکەیێن تەیران ل خوە دکن، ب ئارەزۆیا کو ب ئالیکاریا وان

"بگەهنە" بالاترین قەدەمەیێن علم و زانینێ. لەوما، وسا دهاتە سێورین کو تەیر، شکلگرتنا (تەجەسسوم) ئلم، ئاقل و مێژیێ ژیرە.

د گەلەك ئەفسانە، دەستان و چیرۆکان دە تەیر ئاگاهیێن گرنگ تینن بۆ قەهرەمانان. دبە کو ئەو پەیامبەرێن خوەدایی سەمبۆلیزمە بکن، کو پەیامێن باش دگهیننە مرۆڤان. د هنەك کولتوران دە مرۆڤ ژ تەیران پڕ شکبەرن، ژێ دترسن کو ئەو دێ خاینتییێ بکن و سرێن وان بگهیننە دژمنان. گۆتنەکە بەلاڤە، "تەیرەکی ل سەر دوولکا خوە ئانی"، ژ وێ باوەریا باتل ئا قەدیم هاتییە پێ.

### سەمبۆلیزمان تەیران دئێزدیاتییێ دە

بێشکە کو دینێ ئێزدیاتییێ یەك ژ وان دینێن هەری زەنگینە بۆ نەریتا سەمبۆلان. نەخاسمە، ژ بەر ئێزدیاتی نەریتەکە دەڤکی یە سەمبۆلان جییەکی پڕ فرەهـ هەیە تێ دە. لەوما ئەم دکارن ئێزدیاتییێ وەکی سیستەمەکە سەمبۆلان ببینم کو ئەو سیستەم د جیهانبینیا ئێزدیەکی\ێ یا دەرباری دنیایێ دە خوەدان رۆلەکە بنگەهی یە.

ئارمانجا ڤی کاری ئەوە کو سەمبۆلیزما تەیران د دینێ ئێزدیاتییێ دە ڤەبکۆلە و نیشان بدە کو هەمی سەمبۆل، وەکی ئەلەمەنتێن دینەکی، خوەدان رۆلەکە تایبەتن مینا پرەکە د ناڤبەرا جیهانا راستەقینە و جیهانا تەجروبە و علمی دینی دە.

ئەم دکارن سەمبۆلێن د ئێزدیاتییێ دە هەیی، د چەند کۆمان دە پۆلین بکن، بۆ نموونە:

١- جسمێن ئەسمانی (رۆژ، هیڤ، ستێرکا سبەهێ)

٢- تشتێن پیرۆز (دوڕا سپی، هتد)

٣- هەیوان و تەیر (گا، تاووس، دیکل، هتد)

٤- هژمار (٣، ٧، ٤٠، ٧٢، هتد)

٥- رەنگ (سپی، سۆر، زەر، شین، هتد) و کۆمێن دن.

د میتۆلۆژی و دۆکترینا ئێزدیاتییێ دە، سەمبۆلیزما تەیران خوەدانێ جییەکی تایبەت و بنگەهی یە، هەموو تەیرێن میتۆلۆژیا ئێزدی پۆزیتیفن" پرانی ئان

هەبینێن خوەدایی (خوەدا، سەرەکێ مەلەکان، مەلەك، هتد) سەمبۆلیزمە دکن ئان ژی ب ئاوایەکی تێکلداری تەبەقەیێن روحانینە. سەمبۆلیزما تەیران ئا ئێزدیان، بابەتێن جهێ یێن تەیران دحەوینە کو ئەو بابەت هەمی تێکلداری دەستپێکا مانەوەیی و خوەداییینە بۆ نموونە، تاووس، کو ژ ناڤ هەموویان ناڤدارترین سەمبۆلا ئێزدی یە" دیکل، تەیرێ ئەنقەر، تەیرێ مەزنی سپی، کەڤۆکا سپی و تەیرێن بێوەسف.

گەلەك جاران تەیر، د ئەفسانەیێن کۆزمۆگۆنیك ئێن ئێزدیان دە تێنە دیتن، ئانکو تەیر ژ دەستپێکا دەما ئافرینێ ڤە هەنە، هەتا ل گۆری چەند ئەفسانەیان بەری هنگی هەبوونە.

ئەفسانەیەك هەیە د ناڤ ئێزدیێن ئەرمەنستانێ دە دەرهەقێ دەمێن بەری ئافرینێ دە. ئەڤ ئەفسانە قسەت دکە کو بەرێ بەهرا مەزن هەبوو و ل ناڤێ بەحرێ بنەکە دارا گولێ شین بوو. ل سەر گولییەکە دارا گولێ تەیرەك ڤەنشت کو ئەو تەیر شێخ سن بوو. خەلك دبێژنێ "هۆستایێ گولێ." د ئەینی بەحرێ دە دارا مەزن ڤەنشتن، یەك ژ وان سپی بوو و ئەو خوەدێ ب خوە بوو، یێ دن مەلەکێ جەبراییل بوو.[1] جبراییل ب شکلێ تەیرەکی ڤەنشتە سەر ئەینی دارا مەزن ئا کو خوەدێ لێ، لێ بەلێ مەلەکێ جەبراییل نەدزانی کا کی یە ل کێلەکا وی، هەتا بوو ب ئالیکارییا شێخ سن (ئان ژی، ب یا ڤاریەنتەکە دن، ئەو تاووسێ مەلەکە) تێگهشت کو تەیرێ مەزن ئێ سپی یێ ل سەر دارێ، خوەدێ یە. بەس پشتی هنگی وان هەموویان دەست پێ کرن دنییا ئافراندن.

دەما کو من خەباتا خوە یا قادێ دکر ناڤ ئێزدیێن ئەرمەنستانێ دە، من هنەك ڤاریەنتێن ڤێ ئەفسانەیێ بهیستن کو د وان دە ل دەوسا شێخ سن، تاووسێ مەلەك خویا دبە، و ل دەوسا جبراییل ژی ئێزید. هەموو ڤاریەنتێن ڤێ ئەفسانەیێ سێ هەبینێن پیرۆز (خوەدا، مەلەکێ جبراییل و شێخ سن" ئان ژی خوەدا، تاووسێ مەلەك و ئێزدی) قسەت دکن، کو بەری ئافرینا دنیایێ هەبوونا و ڤەنشتە سەر گولیێن دارا مەزن، کو ئاشکەرایە ئەو گولی، دارا ژیانێ بوو ل ناڤەندا دنیایێ و

---

[1] Bin. Vilchevskiy 1930.

هەروها دارا گولێ کو ل بەحرا مەزن ئا سەرەتایی شین بوو بوو. هەموو ژی ب شکلێ تەیرانن کو ئەڤ یەك گەلەك گرنگ بۆ سەمبۆلیزما ئێزدیاتییێ.

ئەفسانەیا ئافرینێ یا ئەهلی – هەق، کو گەلەکی شبهێ یا ئێزدی یە،[1] دیار دکە کو خوەدێ جبراییل ئافراند کو وەکی پیر بنیامین ژی تێ زانین. سەبارەت ب ڤێ یەکێ د هنەك نرخاندنان دە دبێژە کو جبراییل ل سەر بەیاڤا ئاڤێن ئەول گەریا بێیی کو ئافرینەرێ خوە بناسە[2] (کرێینبرۆك ٦٨: ١٩٩٢). مینا ئەفسانەیا ئێزدیانە. هەر وها، ئەفسانەیا ئەهلی – هەق یا ئافرینێ، دبێژە جبراییل بەری ئافرینا دنیایێ ل سەر ئاڤێ پەرواز دان، ب شکلێ تەیرەکی بوو.

د "مسحەفا رەش" دە دنڤیسە: "پاشی وی جبراییل ئافراند ب تەیرەکی و وی ئەو شاندییە و هەر چار کنار دانە دەستێ وی"(کرەیەنبرۆەك ٧٢–٧٣: ١٩٩٢). بالکێشە کو د هەڤپەیڤانا من ئا ل گەل فەقیر ئەلی (ژ جەللە) دە، وی گۆتبوو من کو ئەو ئێ کو خوەدێ "چار کەڤرێن چار کناران" دانە دەست، تاووسێ مەلەك بوو.[3]

ئەڤ ئەفسانە نیشان ددە کو سەمبۆلەکە تەیرێ هەبوو بەرێ کو خوەدێ هەموو گیانەوەران، هەر ل گەل تەیران، بئافرینە. خوەدێ ب خوە د ڤێ ئەفسانەیێ دە شکلەکێ تەیرەکی سپی و مەزن هەیە. سپی یە، ژ بەر کو ئەڤ رەنگ، رەنگێ کەمالا خوەدایی یە" هەروها ل گۆری زانستەکێ، ئەولی هەموو رەنگێن دن د ناڤ خوە دە حەواندنە. وەکی کو د "مسحەفا رەش" دە دنڤیسە، دوڕا کو دەستپێکێ خوەدێ ژ "جەوهەرێ پیرۆز (سوڕ)"ێ خوە ئافراندبوو ژی، هەر سپی بوو. ل ڤر سەمبۆلا تەیران تێکلداری خوەدایی یێ یە، کو بنیادێن وێ یێن مانەوی دگهینە بەری ئافرینا جیهانا مادی.

---

[1] بنر. کرێینبرۆك ١٩٩٢: ٥٧ – ٧٩.

[2] Kreyenbroek behsa Mokri, M. (1966) dike, Shah-nama-ye Haqiqat\ Le Livre des Rois de ve'rit'e: Histoire traditionelle des Ahl-e Haqq, Vol. 1., Teheran\Paris (Bibliotheque iranienne 14).

[3] ل گۆری گۆتنێن فەقیر ئەلی – پیر ئۆمەرخالی (جەللە، ئەلمانیا).

## ئەنقەر، سیێمورڤ

د میتێن ئێزدیان ئێن ئەفراندنێ دە تەیرەك خویا دبە د هنگاما ئافراندنێ دە، کو ناڤێ وی د کتێبا پیرۆز ئا ئێزدیان "مسحەفا رەش" دە هاتیە" و هەروها د ئەدەبیاتا دەڤکی یا ئێزدیان دە ژی بەحس لێ دبە. تەیرەکە ب ناڤێ ئەنقەر. ل گۆری "مسحەفا رەش"ێ، ب وەرگەرا جوزێف: "بەرێ خوەدێ دوڕا سپی ئافراند ژ سرا خوە یا هەری ئەزیز. وی تەیرەك ژی ئافراند ب ناڤێ ئانگار.[1] وی دوڕا سپی ل سەر پشتا تەیری ب جی کر و چل هەزار سالان ل سەر وێ ئیقامەت کر " .(Joseph 1919:36)

دەولکا زیڤ یا زێرکری (سەدسالێن ۳ –۷ئان ب. ز ئیران) ل قەراغێ ژۆرین شکلێن سیێمورڤێ هەنە

[1] د کتێبا جوزێف (۱۹۱۹) دە ناڤێ تەیری وەکی "ئانگار"ە، لێ بەلێ ئێزدی تەخەر وەکی "ئەنقەر" ئان ژی "عەنخەر" تەلەفووز دکن.

د وەرگەرا پرۆف. د. کرییێنبرۆك (٧٢: ١٩٩٢) یا "مسحەفا رەش" دە، کو ل گۆری ڤەرسیۆنێن ب کوردی و ئەرەبی چێکربوو، دنڤیسە کو "بەریێ خوەدێ دورا سپی ئافراند ژ سرا خوە یا ئەزیز و کەڤۆکەکە سپی ئافراند کو ناڤێ ئەنفەر لێ دێرا و دور ل پشتێ ب جی کر و ل سەرێ روونشت بۆ چل هەزار سالان. " ل ڤر تەیرێ "ئەنفەر"، کەڤۆکا سپی یە.

ل گۆری قەولێن ئێزدیان (ئەدەبیاتا دینی یا دەڤکی)، تەیرێ ئەنقەر ڤەدنشە سەر گولیەکی دارا هەرهەرەییێ، کو ل بهەشتێ شین دبە. ل گۆری وێ، ٧٢ باسکێن ئەنقەر هەنە، و ل سەر یەك ژ وان گایەك هەیە:

**هەی مالا من، تەیرەك ل ئەزمانا وی هەی، ناڤێ وێ ئەنقەرە.**
**هەفتی و دوو پەرە.**
**پەرەکی گای ل سەرە.**

**چەندی تەیرەك ل ئەزمانا وێ هەی، ناڤێ وی ئەنقەر ب ناڤە.**
**رۆژا عید و ئەرەفاتا دەرکەفت ژ کانیا سیهانیێ.[1]**
**چەنگە و باسکێت خۆ ڤە دەوشینیێ،**
**ژێ دچیێ شەوق و شەمال و نوورین و خۆناڤە.**

(راشۆ ٢٠٠٤: ١٠٥٠–١٠٥١)

وها، تەیرەکی دن ژی هەیە د سەمبۆلیزما تەیران ئا ئێزدیاتییێ دە، کو خوەدێ ئەو ئافراندی یە، نها ل بوهشتێ دمینە، دانییە ل سەر گولییەکی دارا هەرهەرەییێ و هەژمارەکە سەمبۆلیك ئا باسکێن وێ (٧٢[2]) هەیە.

---

[1] " کانیا سهانیێ" سەرەکانیەکە کو ل گۆری ئەفسانەیێ ل بوهشتێ یە.

[2] ئەفسانەیەکە دیتر هەیە دەربارێ ماسیا ب ٧٢ پوولان، کو ل سەر یەك ژ وان گایەك هەیە و ل پشتا وی ژی دنیا ب جی یە. د ترادیسیۆنا ئێزدیان دە ژ ٧٢ مرۆڤان (٣٦جمك – جێوی) هەموو مرۆڤ پاشکەتن. ژ بلی ئێزدیان ٧٢ ملەت هەنە ل دنیایێ ئێزدی دبێژن: "برا خوەدێ بێ هەوارا هەفتیێ دو ملەتا، پاشیێ وەرە هەوارا ئێزدیخانە." هەژمارا ٧٢، یەك ژ هەژمارێن

خ. ج. رەشۆ پێ باوەرە کو ئەڤ تەیر سەمبۆلەکە ئیمازێن سەمبۆلیك ئێن تاووسێ مەلەکن (رەشۆ ٢٠٠٤: ١٠٥٠ ).

د شعرا فارسان دە، شعرا سووفی ژی تێ دە، تەیرێ ب ناڤێ "ئانقا، مقابلی، هەتا هەڤ واتەیێ ناڤێ سیموورگێ یێ ب ئەرەبی تێ قەبوولکرن.[1]

سێنمورڤ

هەری ب قیمەت ئێن سەردەما ئانتیکە. دەربارێ واتەیا پیرۆز ئا ڤێ هەژمارێ دناڤ کولتورێن جهێ دە بنێرە د ناڤ. Schimmel Annemarie (1993), The mystery of numbers (Hikmeta Hejmaran). N.Y.Oxford, rp. 268.

[1] تەلەفووزا ب فارسیا نووژەن ئا ڤی ناڤی "سیمورخ"ە" ب پەهلەڤی – سێمورو ( .Avest mereyo saeno" تەلەفووزا ب پازاندی – سن، سنایە (Chunakova 2004:200)

قـەدیمترین بەشـا ئاڤێستایێ كـو بەحـسا سـیمر لێ تـێ كـرن "یاشـت"ە. د بووندامیشنێ دە دبێژە كو "تەیرێ سەن" تەیرێ هەری مەزنە (بونداهسهن ۱۹۹۷: ۲۸۲) و بـەری هـەموو تـەیرێن دن ئـەو هـاتبوو ئافرانـدن، نـە ژ بـۆ ڤـێ دنیـایێ (بونداهسهن ۱۹۹۷: ۲۹۹). ئەو ژ تەیرێ چامرۆش ( Pehl. Cinamros, Pazend. Camros) بالاترە بۆ قەدر و قیمەتا خوە (بونداهسهن ۱۹۹۷: ۳۰۰)، كو چامرۆش، تەیرەكی میتۆلۆژیك، ڤەدنشە نـك سـیمر هـەر ل سـەر گـولیێن ئـەینی دارا " دارا دەرمـانێ هـەموو دەردان" (Chunakova 2004: 252) ئـان ژی "دارێ هـەموو تۆڤان" (Bertels 1997: 167).

تـەیرێ سـیمر د میتۆلۆژیـا ئێزدیـان دە خـودانێ رۆلەكـە گرنگـە" بـێهتر د ئەدەبیات و پەندێن كوردی دە تێ دیتن، بۆ نموونە:

مافورەكە كوردی ب شكلێ
"دارا ژیانێ" ل سەر،
مووزەیا تەكستیلا كوردی ل هەولێرێ،
كوردستانا ئیراقێ، ۲۰۰٦.

" دارا ژیانێ"
دەتایەكە دێولكەكە زیڤین.
The Hermitage (Xelwetxane)
سانكت – پێتێرسبوورگ، رووسیا

" ئەمرێ تە چار ئەمرێ سیمرە"، کو تێ واتەیا ژیانەکە شاد و بەختەوار. لێ بەلێ هەموو ئێزدی گوهـ ل سیمر بوونە.

د هەمی دیرۆکێن تێکلداری تەیرێ ئانقایێ دە، مرۆڤ ب ئاشکەرایی ئەلەمەنتێن ئەفسانەیێن سەمیتیك دبینە، کو پشتی تەڤل شعرا سووفی بوویی تەڤ ترادسیۆنا زەنگین ئا ئیرانی یا ئەفسانەیێن ل سەر سیمر (بێرتێلس ۱۹۹۷: ۲۰۲). بالکێشە، ناڤێ ئانقا د فەرهەنگێن فارسی یێن سەدسالا هەڤدەهان دە وەکی مقابلا ب عەرەبی یێ کەلیمەیا سیمر هاتییە پێناسەکرن، ئان ژی وەکی " ئانقایا رۆژئاڤایی" کو ئەو ژی وەکهەڤە ل گەل سیمر (بێرتێلس ۱۹۹۷: ۲۰۱). دەما مرۆڤ گوهـ ب بێرتێلس (بێرتێلس ۱۹۹۷: ۱۷۷–۱۷۸) و هنەك ئاکادەمیسییەنێن دن دکە، ب یا وان ئیماژا تەیرێ سیمر دگهە دەمێن بەری زەردەشتییێ، دبە کو ناڤێ ئەنقەر ێ د ترادسیۆنا ئێزدیان دە پشترە ل جییێ تەیرێ سیمر هاتبە بجیکرن.

### دیکل

تەیرەکی دیتر کو د ترادسیۆنا ئێزدیان دە خویا دبە، دیکلە.

د گەلەك ترادسیۆنان دە، تێکلییا دیکلی ب رۆژێ رە، پر ئاشکەرایە و د ناڤەندا ئیماژێن میتۆلۆژیك ئێن دیکلان دە یە. دیکل سەمبۆلا فەرەنسایێ یە و ژ کەلەپوورێ قەدیم ئا گالایان تێ.

د فراگاردا هەژدەهەمینا ئا "ڤدەڤدات"[1] ێ دە – یەك ژ کتێبێن پیرۆز ئێن کتێبا پیرۆز ئا زەردەشتییێ "ئاڤەستا"یێ – هنەك بەیت (خەت) هاتنە تەرخان کرن بۆ پەسنێ پارۆدارشا تەیرێ (تەرەولێ) سرۆئاشا – دیکلێ کو د زەردەشتییێ دە ل دژی دێڤێ ترالییێ بووشیاستایا "دەستدرێژ"ە (ئاڤەستا ۱۹۹۸: ۱۱۹).

---

[1] ناڤێ ڤێ کتێبێ ب فارسیا ناڤینی (پەهلەڤی) "ڤیدئێڤدات"ە. ژ "Vi Daevo Datem"یا ب ئاڤێستایی تێ، ئانکو "کۆدەکسا ل دژی دێڤان." ۲۲ بەش هەنە د ڤێ کتێبێ دە ب ناڤێ " Fragard ". ئان ژی بنر.: Avesta v russkikh perevodakh (1861 – 1996), Sost., obsh. Red., primech., spravochniy razdel I.V. Raka. SPb., 1998.(چاپا دوویەمین )

ئیمارژا دیکل، د پرانیا ترادسیۆنان ده تێکلداری خوەندنێن شەفەقا سبەهێ، رۆژێ و ئاگرێ خوەدایی یە. ئێزدی، هەروەکی زەردەشتییان، رۆژێ دحەبینن وەکی سەرەکانییەکە ژیانێ و هەبوونا خوەدایی یا ئاشکەرا ل دنیایێ" و ئاگر دحەبینن وەکی جلقەیا خوەزایا رۆژێ ل سەر ئەردێ.

**شێخ ئامادین.** مالەکە شێخان هەیە د ترادسیۆنا ئێزدیان دە کو خوارنا گۆشتێ دیکل ل وان گونەهە. ناڤێ ڤێ مالێ شێخ ئامادینە.[1] ئەو شیان ل وان هاتییە بەخشاندن کو زارۆکان ژ زکێشییێ و خەونێن خراب خلاس بکن. وسا باوەر دکن کو هەکە کەسەك ژ وێ مالێ، هەما بۆ جارەکێ ژی بە، گۆشتێ دیکلان بچێژە، ئەو دێ ڤێ شییان و بەهرەیا خوە هەتا هەتایێ ندا بکە.[2] ئەو دبێژن:

**شێخم، شێخێ دلا**
**ناخوم گۆشتێ دیکلا،**
**دەستێ من دەرمانێ هەموو دلا.**[3]

ئۆجاخەکە پیران هەیە د ناڤ ئێزدیان دە ب ناڤێ پیرێ جەروان، کو ئێزدیێن ئیراقێ دیکلان وەکی خێر ددنە وان.

جارنان دیکل، وەکی تەیرەکی پیرۆز ژی تێ قەبوولکرن، ژ بەر کو ئەو بانگا هاتنا رۆژێ ددە و راستەراست د تێکلییێ دە یە ب رۆژ و رۆناهییێ رە.

**تاووسی مەلەك**

یەك ژ سەمبۆلێن هەری موهیم د ئێزدیاتییێ دە، ئیمارژا تاووسە. ل رۆژهلاتێ تاووس سەمبۆلا بەدەوی و موکوممولییێ یە.[4]

---

[1] شەمسانی – شێخ شەمس – ئامادینێ شەمسا.

[2] ل گۆری کەرەمێ تەمۆ – شێخ ئامادین.

[3] ل گۆری سەیرانا شەمۆ.

[4] د ئیلاهییێن ئێزدیان دە چەند جاران ستیا تاووس تێ گۆتن (زارگۆتنا ... ١٩٧٨). دایکا شێخ ئادی – ستیا ئێس ب ڤی سفەتی هاتیە پەرووکرن.

هەر کەسێ کو دەربارێ ئێزدیان دە ئاگاهیدارە، بێشك دزانە کو ئێزدی تاووسێ مەلەك دحەبینن و زانیاریێن گەلەکی موختەلف و دژی هەڤ تێنە پێشخستن سەبارەت ب تاووسێ مەلەك.

گەلەك گۆتار دەربارێ تاووسی مەلەك دە هاتن نڤیساندن. ئەز ل ڤر بەحسا هەموو زانیاریێن هەیی ناکم، ئەز دێ تەنێ چەند راستیێن بالکێش و چەند بۆچۆنان دیار بکم.

**ناڤ.** د "مسحەفا رەش" دە نڤیسییە: "خودێ مەلەك ئەزازیل ئافراند و ئەو تاووسی مەلەکە." ئەڤ ناڤ (ئەزازیل)، د ناڤ ئێزدیان دە نایێ بکارئانین. ئێزدیێن وەلاتێن جهێ ڤێ سەرمەلەکێ ب ئاواییێن جودا ب ناڤ دکن:

| | |
|---|---|
| * ئەزازیلێ کو تاووسی مەلەکە | د"مسحەفا رەش" دە" |
| * تاووسێ مەلەك | ئێزدیێن ئیراقێ. |
| * مەلەکێ تاووس | ئێزدیێن ئەرمەنستان و گورجستانێ |
| * خەجێ تاڤووس | ئێزدیێن ئیرانێ |

**شکلێ سەمبۆلیکێ تاووسی مەلەك**

دەربارێ تاووسی مەلەك دە نها گەلەك فکر و بۆچۆنێن جهێ هەنە د ناڤبەرا لێکۆلینەران دە. کەلەپوورا ئێزدی پرانی ب دەڤکی هاتییە هەتا ئیرۆ، لەوما ئەم نکارن بەرێ خوە بدنە کتێبا پیرۆز (خوە "مسحەفا رەش" ژی)، کو دبێژە: "دڤێ هایا مە ژ هەموو ڤاریانتێن دەڤکی یێن دەستان و ئیلاهییێن ئێزدیان هەبە".

## نەخوە تاووسی مەلەك کی یە؟

**یەکەمین سەرمەلەك.** تاووسێ مەلەك ب پایەیا هەری بلند دە یە ب کۆزمۆگۆنییا ئێزدیان دە. د کتێبا پیرۆز ئا ئێزدیان "مسحەفا رەش" دە نڤیسی یە کو بەری ئافرینا کنیاتێ خوەدێ ئەو وەکی یەکەمێ هەر هەفت سەرمەلەکان ئافراندی یە و پشتی وەکی "سەرەکێ وان هەموویان" تایین کرییە: "رۆژا ئەول، یەکشەمێ، خوەدێ، مەلەکێ ئەزازیل ئافراند و ئەو تاووسێ مەلەکە، سەرەکێ هەموویان"، "و وی مەلەکێ تاووس کر سەرۆکێ هەموویان" (Joseph1919:36,37).

**مەلەکێ باوەرییێ.** جارنان، تاووسێ مەلەك وەکی "مەلەکێ باوەرییێ" تێ بناڤکرن و ب ڤێ تێکلییێ مرۆڤ دکارە وێ ب سراۆشایا زەردەشتییێ رە موقایسە بکە[1] — روحێ باوەری، دسپلین و فیداکارییا دینی.

**پیر.** گەلەك ئێزدی دبێژن تاووسی مەلەك ب خوە پیرە و وەك "باڤێ پیران" تێ حەسێبکرن.[2] تۆسنێ رەشید، ب گۆتنێن شێخ رۆستەم، د کتێبا خوە دە دنڤیسە کو مەلەکێ تاووس ب خوە پیرە و تاووسی مەلەك رە وسا دبێژە: "پیر مەلەکێ ئەللەدی" (تۆسنێ رەشید١٥٦: ٢٠٠٤).

یا راستی، هەکە ئەم دێنا خوە بدنە پێنج فەرزان (پێنج فەرزێن هەقیقەتێ) کو دڤێ هەر ئێزدییەك وان ب جی بینە، ئەم دکارن راڤەیا ڤێ فکرێ پەیدا بکن. پێنج پرەنسیبێن ئێزدیان ئەڤن:

---

[1] تەلەفوزا ب ئاڤێستایی سراۆشا یە "عیتائەت"" ب فارسیا ناڤینی سرۆش، فارسی سورووش. د چاڤکانییێن پەهلەڤی دە، جارنان سارۆشا د ناڤ ئامێشا — سپێنتایان دە تێ رێزکرن.

[2] پیر رزایێ کاکێ، شێخ کەرەمێ تەمۆ و گەلەکێن دن ژی.

چ بوون هەر پێنج فەرزێ هەقیقەتێ؟
شێخ، پیر، هۆستا و مەرەبی،
یار (و) برێ ئاخرەتێ.[1]

تێ زانین کو پیرێ چل مالێن پیران، پیر هەسمەمانە – "پیرێ چل پیران."
لێ بەلێ، هنەك مالێن پیران هەنە کو پیرێ وان نە پیر هەسمەمانە. بۆ نموونە: پیرێ ئۆمەرخالی و پیرێ هەسەنچنەری (ئەو هەردو برا بوون[2])، پیرێ مهەمەد رەبەن و هتد. پیرێ پیران ئۆمەرخالی و هەسەنچنەری، پیرەکە ژ ئۆجاخا حەجی مهەمەد[3]، کو ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ وەك "حەجی مهەمەدێ بێ زورەت" ناڤ دکن. پیرێ پیرێ بوالێ، پیرەکە ژ مالا پیرا فاتێ. د کتێبا خ. ج. رەشۆ دە، ئاشکەرایی دنڤیسە کو پیرێ پیر مهەمەد رەبەن و پیرێ پیر هەسمەمان، تاووسێ مەلەك ب خوە یە (رەشۆ ١٩٩٨: ٢٠٣).

پیر تاووسێ مەلەك و پیر بنیامین. گۆتارەکە بالکێش ئا پرۆف. د. کرینبرۆك هەیە ب ناڤێ "Mitra and Ahriman, Binyamin and Malaki Tawus" (میترا و ئەهریمان، بنیامین و مەلەکێ تاووس) (کرینبرۆك ١٩٩٢)، کو تێ دە نیشان ددە کو مانەندییەکە ئاشکەرا هەیە د ناڤبەرا مەلەکێ تاووسێ ئێزدیان و بنیامینێ ئەهلی هەقان دە. لێ بەلێ ئەهلی هەق و ژی ئێزدی وان وەکی خرابی شەرح ناکن.

روحێ خراب. ل گەل ڤێ ژی، هنەك گەرۆکان وسا فکرییە کو ئێزدی "خرابپەرست" ("دێوپەرست")ن ب تەنێ ژ بەر وان ئا تاووسی مەلەك. هنەك

---

[1] قەولێ ئێزدیان "قەولێ شەرفەدین" بنر. د ناڤ: ئۆمەرخالی خ. ٢٠٠٥: ١٠٣.
[2] بنر. "قەولێ ئۆمەرێ خالا."
[3] ئێزدیێن ئەرمەنستان و گورجستانێ دبێژنە ڤێ ئەشیرێ "حەجی مهەمەدێ بێ زورەت" ژ بەر کو تو نەسل (زورەت) نەمان ژ ڤێ مالێ ل ئەرمەنستان و گورجستانێ. تەنێ ل ئیراقێ هەنە.

نڤیسکاران ژ مێژ ڤە یە ئەو وەکی "تەجەسووما خرابیێ" ب ناڤ کرنە. چ پەیوەندیا ئیفادەیێن وسا تونە ل گەل تەسەوورا ئێزدیان ئا ڤی سەرمەلەکی.

**باوەری ئەتقاتا خوە**
**تاووسی مەلەك دایە.**[1]

ل گۆری فکرێن ئێزدیان، تاووسی مەلەك نە روحێ خرابە، لێ هنەك زانیار (وەك جوزیف) وها دنڤیسن: "ب من وسایە کو پرسا راستی نە ئەوە کا مەلەکێ تاووس کی یە، لێ بێهتر، کا چاوا خرابی — خوەدا هات و ب ئیماژا تەیرەکی هاتە سەمبۆلیزەکرن. ئەڤ پرس جەوابا خوە د ڤێ راستییا هانێ دە پەیدا دکە کو پەرستنا ل تەیران دیارە قەدیمترین شێوەیێ سەنەم پەرستییێ یە " (جوزیف 1919: 150).

نە وەکی یا گەلەك نڤیسکاران کو گەلەك جاران دنڤیسن و تاووسی مەلەك وەکی "روحێ خراب" ب ناڤ دکن، د ناڤ ئێزدیان دە تاووسی مەلەك روحێ خراب تەمسیل ناکە. رسواکرنا خوەدێ ل تاووسی مەلەك، ژ ئالییێ هنەك نڤیسکاران ڤە جهێ هاتییە راڤەکرن و شرۆڤەیێن جودا ل سەر هەنە. ل گۆری یەکێ، ئەو ژ خوەدێ هاتە دوورکرن ژ بەر خورروورا وی. وی نەخوەست سجدێ ببە مرۆڤەکی ئافراندی — بۆ ئادەم. ل گۆری ئیزاحاتا ئێزدیان ئا ئەول، بێیتائەتییا تاووسێ مەلەك، ب وەفادارییا وی یا تایبەت ب خوەدێ، ئافرینەرێ وی، تێ راڤەکرن. یانی ئەو یەکەمین بوو کو قەبوول کر: "خوەدێ یەکە." دەما خوەدێ هەفت سەرمەلەکێن ئەسمان ئافراندن، ژ وان رە گۆت، وەکی ژ بلی وی ژ بەر تو کەسی پانتە نەدن، ئانکو سوجدە بۆ کەسی نەکن.

دیمیوورگ. هنەك زانیار، بۆ نموونە" سێمێۆنۆڤ، تاووسی مەلەك ل گەل دیمیوورگ موقایەسە دکن (سێمێۆنۆڤ: 1927)، ژ بەر کو خوەدێ گۆتە وی: "

---

[1] ژ قەولێ بەرێ شووشتنێ." ل گۆری پیر رزایێ کاکێ.

**زیارەتا شێخ مەند. کوردستانا ئیراقیێ، شێخان. ٢٠٠٦**

وەك تیێ زانین دین نە تەنیێ ب رێکا سیستەما باوەرییان ئەیان و دیار دبە، لیێ ب ئەینی شکلی د ناڤ عەدەتێن دەڤکی یێن وەکی ئێزدیاتییێ دە ب رێکا سیستەما سەمبۆل و ریتووەلێن کو ویێ ڤەدگوهەزن ژی. ریتووەل ئاوایەکی گوهاستنا زانیاریانە ل سەر نرخێن سەرەکی یێن جڤاکەکی. شاگرتیێ ی. م. لۆتمان، ئا. ك. بازبۆرین د ڤەکۆلینێن خوە دە دگهە ویێ قناعەتیێ کو ریتووەل شێوەییێ رەفتاریێ یا سەمبۆلیکە کو خوەدانیێ رێزمان، سینتاکس و ڤۆکابوولەرا خوە یە، یانی ب ئاوایەکی تەکستیێ دکە. ریتووەل وان ئالییێن تشتان، حەرەکەت و دیاردەیا ئەیان دکە کو د ناڤا ژیانا رۆژانە دە نەپەنی نە، نەدیارن، لیێ د راستییێ دە ئەسل و بەریێ وان تشت و حەرەکەت و فێنۆمەنان خویا دکن. بێشك، ریتووەلێن ئێزدیان تەکستەکە سەمبۆلیك نیشان ددن گوهاستنا زانیاریان ل سەر نرخێن ئەسلی یێن جڤاکا ئێزدیان، ل سەر هزرا وان ئا دینی یا سەبارەت ب دنیاییێ. رۆلا وان د تێگهشتنا دینیێ ئێزدیان دە بیێ حەد فەرز و گرینگە.

## جەژنا خدر نەبی و خدر ئەیلاس

**هەوارا مە خدر نەبی، خدر ئەیلاس**
**سوارێ هەسپێ بۆز**

ئێزدیان هەتا نها ژی ئادەتێن خوە یێن کەڤنار، رێ و رسمێن خوە، رابوون– روونشتن کال– باڤێن خوە گەلەك باش خوەیی کرنە. جەژنێن ئێزدیێن ئەرمەنستانێ، گورجستانێ و رووسیایێ هەری مەزن و فەرز ئەون: جەژنا خدر نەبی و خدر ئەیلاس (مەها سباتێ)، کلۆچا سەرێ سالێ (مەها ئاداری) و ئەیدا رۆژیێن ئێزید (مەها کانوونا یەکێ).

د ڤێ پارێ دە ئەز ل سەر رێ و رسمان، کو وەختێ جەژنا خدر نەبی و خدر ئەیلاس دە تێن دەرباسکرنێ جەم ئێزدیێن ئەرمەنستانێ، گورجستانێ و هەر وسا ژی جەم ئێزدیێن رووسیایێ، مژوولبم.

فەلسەفەیا دینێ ئێزدیان هەتا رۆژا مە یا ئیرۆ ژی دەڤکی یە. لۆما ژی چاڤکانییا من ئا هەری بنگەهین ل سەر رێ و رسمێن ئێزدیان، ل سەر جەژنێن ئێزدیان و رابوون – روونشتنا وان گۆتن و ڤەگۆتنێن کال–باڤێن مە، مەزنێن مە ئێن ژ سەدان سالانە گهاندنە رۆژا مە یا ئیرۆ.

جەژنا خدر نەبی و خدر ئەیلاس جەژنا ئێزدیانە، کو ب ناڤێ دو خودانان تێ ناسکرن: خدر نەبی و خدر ئەیلاس (ئەلیاس).

خدر نەبی جەم ئێزدیا خودانێ حەزکرن و مراز حاسلکرنێ یە، خدر ئەیلاس ژی تێ حەسابکرن چا پشتەڤانێ ئەو کەسێن کو نەخوەشن، رێوینە و مەریێن گرتی.

### کەنگێ ئەڤ جەژن تێ دەرباس کرن؟

ژ ئالیێ ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ ل رۆژا ئینیا یەکێ – ل گۆر رۆژنیشانا رۆژهلاتی، کو ب سێزدەه رۆژا دکەڤە پاش سالناما ژ دایکبوونا ئیسا– ژ

مەها سباتێ تێ دەرباسکرن. یانی نها ئەم دکارن بێژن، کو ئەڤ جەژن دکەڤە رۆژا ئینیا سسیا ل مەها دودا ل گۆر رۆژنیشانا گریگۆریانی. ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ رۆژا ئینییێ ئەید دەرباس دکن، لێ ئێزدیێن کوردستانا ئیراقێ، تورکییێ و سورییێ ڤێ جەژنێ د دو رۆژا دەرباس دکن: رۆژا پێنجشەمێ ب ناڤێ خدر ئەیلاس و رۆژا ئینییێ ب ناڤێ خدر نەبی.

جەژنا خدر نەبی جەم ئێزدیێن ئەرمەنستانێ، گورجستانێ، ئیراقێ، تورکیەیێ و سووریەیێ دهات دەرباسکرن:

| ٢٠٠٥ | ٢٠٠٦ | ٢٠٠٧ |
|---|---|---|
| ١٨,٠٢ | ١٧,٠٢ | ١٦,٠٢ |

ئێزدیێن ئیراقێ، تورکیەیێ و سووریەیێ ئەیدا خدر ئەیلاس پێنج شەمێ دەرباس دکن:

| ٢٠٠٥ | ٢٠٠٦ | ٢٠٠٧ |
|---|---|---|
| ١٧,٠٢ | ١٦,٠٢ | ١٥,٠٢ |

پێش دا گەرە بێ گۆتن، کو خدر نەبی و خدر ئەیلاس جەم ئێزدیان چا وەکی سەمبۆلا ژیانا تێن بەر چەڤ و ناڤێن وان د چیڤانۆکا ئەسکەندەرێ مەکەدۆنی دە تێن کفشێ. چیڤانۆک وسا نیشان دکە، کو خدر نەبی و خدر ئەیلاس بۆنا ئەسکەندەری چووبوونە ئاڤا ئاڤلهەیاتێ (ب چ ئێزدیێن ئیراقێ دبێژنێ ئاڤا هێوانێ) بینن.

لێ رێ ڤە ئاڤا ئاڤلحەیاتێ ژ دارێ سەر وان دە رژیایە و خدر نەبی و خدر ئەیلاس نها هەرتم ساخن.[1]

---

[1] خەلیل جندی رەشۆ و خانا ئۆمەرخالی. ئەیدا خدر نەبی و خدر ئەیلاس دا\\ هما نوو. ١٤٢. ووپپێرتال، ٢٧ سبات، ٢٠٠٦.

## سێ رۆژ بەری جەژنێ

رۆژی. رۆژییێ خدر نەبی (ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ جارنا دبێژنێ خدر نەڤی) سێ رۆژان رۆژییێ دگرن. ل جەم ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ ئەو رۆژی ژ سێشەمێ دەست پێ دکن و رۆژا ئینییێ جەژنا خوە دەرباس دکن. لێ ل جەم ئێزدیێن کوردستانا ئیراقێ و سورییێ رۆژا دووشەمێ رۆژی دەست پێ دکن و رۆژ پێنجشەمێ و ئینییێ جەژنا خوە دکن: رۆژا پێنجشەمێ بۆنا خدر ئەیلاس و ئینی بۆنا خدر نەبی.

رۆژییێ خدر نەبی سێشەمێ سبێ زوو (بەری دەرکەتنا رۆژێ)، سائەت شەشان، پێنجان، رادبوونە پاشیڤێ. تەڤی مەزنان زارۆك ژی رادبوونە پاشیڤێ، چمکی وان ژی رۆژی دگرتن.

ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ باوەر دکن، کو هەر ئێزدی بەری ئەیدێ گەرە ب رۆژی بە و فەرق تونە ناڤێ وی چیە. لێ ئێزدیێن کوردستانا ئیراقێ و سووریەیێ دبێژن، کو ناڤێ کێ خدر یان ئەیلاس بە، ئەوانا گەرە ئەسسەهـ سێ رۆژا ب رۆژی بن. کەسێن دن ژی ئەو کی بخوازن دکارن رۆژی بگرن، دکارن نەگرن.

ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ وسا باوەر دکن، کو رۆژی گرتن بۆرجێ هەر ئێزدی یە. لێ بۆنا جاهلا ئەو بۆرج دوبارە دبە، چمکی ئەوانا گشك ژی بەرمرازن. خدر نەبی چما مێرەکی مرازبەخش، پێشییێ دچە هەوارا وان مەرییا، فکرێ کێ مژوولن پرسێن سورێ، حوبا و حەزکرنێ ڤا، ئالیکارییا وان دکە و مرازێ وان، خوەستنا دلێ وان دقەدینە.

شە و دەرزی. ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ، مەخسووس، وەختێ رۆژیگرتنێ، چێر نەدکرن، سابوون و شە نە ددانە خەباتێ هەتانێ سێ رۆژێ رۆژییێ دەرباس نەبوویا. پەیی خلاسبوونا رۆژیان را پاشێ مەری دکارە ب ڤان تشتان شوخولێ خوە بکە. ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ بەرێ (و جارنان نها ژی) باوەر دکن، کو د ڤان رۆژان دە ئیزنا ئێزدیان تونە وەکی د حەمامێ دە خوە ئاڤێ خن، نکارن ئەردێن ئۆتاخێ بشۆن، و هەر وسا ژی ئیزنا وان تونە

سابوونیێ، شه و دەرزی بدن خەباتیێ. ئەو وسا باوەر دکن، کو خدر نەبی ڤان رۆژان دە ل سەر هەسپێ خوە دنێ دە دگەرە. وەکی مەری خوە حەمامێ ئاڤێ خە، وێ ئەڤ ئاڤا پێشییا خدر نەبی چاوا بەحرەکە مەزن بێ کفشێ و ئەوێ نکاربە دەرباس بە و بێ مالێن وان ئێزدیان. وەکی سابوونێ بدی خەباتێ، وێ پێشییا خدر نەبی چۆلا بووزا بەرێ بێ کفشێ، یانی دەشتا بووزێ زاف چەتن (زەحمەت) بۆنا دەرباسبوونا خدر نەبی. لێ وەکی دەرزی بدی خەباتێ وێ چۆلێ پێشییا خدر نەبی بی ستریندار چێبە و هاتنا وی چەتن کە. وەکی شە بدی خەباتێ، وێ پێشییا خدر نەبی مێشەیێ تەری و مەزن بێ کفشێ. لۆما ژی ئێزدی ڤان تشتێن من گۆتن ب کار نایینن، کو ئالیکارییا خدر نەبی بکن، کو هێسا ئەو رۆژێ دە بگەرە مالێ گشکی ئێزدیێن دنیایێ دە.

ئیرنا ئێزدیان تونەبوو ڤان رۆژان، مەسەلە، شە بدە خەباتێ، نە تەنێ ژ بەر کو، باوەر دکن، کو پێشییا خدر نەبی مێشەیێ تەری مەزن بە، لێ فکرەکە دن ژی ڤرا هەیە. وەختێ رۆژیگرتنێ مەری گەرە دەرهەقێ روحێ خوە، نە بەدەویا (خوەشك–بوونا) خوە، بفکرە. گەرە روحێ خوە پاقژ خوەیکە و تەنێ بۆنا پاقژبوونا وی بفکرە و شەرپەزە بە. ئەز باوەرم، کو هنگێ رۆژییێ مەرییێ وسا، ب راستییا مالا خوەدێ، وێ قەبوول بە.

بۆیی چ مەری رۆژیا دگرە، خوە برچی، مەحرووم و بەلەنگاز دکە، خوە ژ گەلەك تشتێن جمعەتی–جڤاکی ددە پاش؟ ئەڤ گشك زەلوولی چەتنییا مەخسووس مەری دەرباس دکە و دکشینە، کو روحێ خوە، نەفسا خوە، دلێ خوە، فکرێن خوە پاقژ و تەمیز کە بەری رۆژا جەژنێ. مەریێن وسا فکرێن وان، گۆتنێن وان و کرنێن وان پاقژن.

**نانێ مرییا**. هەر سێ رۆژان ژی ئێزدی "نانێ مرییا" دەردخن. "نانێ مرییا" – ئەو جوورە جوورە خوەرەك، ئەمەك، ئێمیش، جخارە، ئاڤا ئێمیشا و تشتێن مایین، دلێ کێ چ دخوەست. لێ هەرتم، چیا ئیدا ببوو قرار، ئەو تشتانا گەلەکی تشتێن لاپی باش و خوەش بانا. نانێ مرییا رۆژا پێنجشەمێ، ئێڤارا ئینییێ وەختێ دەردخستن، وەك "ئێڤئارین" دهاتە بناڤکرن. نانێ مرییا بدنە کی مالێ ژی

دەرباس دبە، لێ زەحف جارا دبنە مالا ئێزدیان، مالێ "تەریقا."[1] ببنە مالا کێ ژی خێرە. وەکی بدی جیناریێ خوە ژی دیسا خێرە. نانێ مرییا گەرەکە بهاتا دەرخستن بەری ئێڤاریێ، لێ گەرەکە رۆژ هێ نەچوویە ئاڤا.

نانێ مرییا – ئەو خێرا مرییێ ئێزدیایە، ئەو بیرئانینا مرییێ وانە، ئەو بیرنەکرنا کال-باڤا و پێشییێ ئێزدیایە. یانی گۆتنێ کال – باڤا ژی، کرنێ کال-باڤا، جەفاییێ وان ژی گەرەکە بیر نەکن و نەدنە دەیا.

پاقژ. ئەڤ جەژن، یەك ژ جەژنێن مەزن و فەرزە ل جەم ئێزدیان. بەری جەژنێ و گەلەك جارا ژی بەری رۆژییا هەموو ئێزدی مالا خوە پاقژ دکن. و ل گوندا خانیێن خوە ژی دشۆن یان ژی تەمیز دکن. رۆژییێ خوە دەست پێ دکن ب تەمیزییا خوە ڤە، تەمیزییا مالێ و ناڤ مالێ ڤە.

### شەڤا بەری ئینییێ

ئێڤارا ئەرەفاتێ و فتار. ئێڤارا ئینییێ، بەری جەژنێ، گوندان دە گشك گوندی هەڤ دگرتن و تەڤی هەڤ دچوونە مالا تەریقێ گوند. تییا دبوون بەر ستێر.[2] پاشێ روودنشتن بەر تەختێ حازرکری ب خوەرەك– ئەمەکا ڤە و فتار دکرن. وێ ئێڤارێ را دگۆتن "ئێڤارا ئەرەفاتێ." وێ ئێڤارێ خەبەردان دچوو دەرهەقێ دین دە، خوەیکرنا رێ و رسمێ کال –باڤا، رابوون – روونشتنا ملەت و وسا ژی گلییێ خوە دکرنە یەك بۆنا دەرباسکرنا سبەترێ ئەیدا خدر نەبی. وسا ژی دهاتە گۆتن ناڤێ مەرییێ دلشکەستی – سەرەخوەشییێ کێنە.

وێ ئێڤارێ ئەسسەهـ قەول، بەیت، دوعا و درۆزگە دهاتنە گۆتن، پاشێ مریدا تەماما ژی "ماشێ قەول، دوعا و درۆزگە" د دانە تەریقێ وەکی خێرا خوە، خێرا دێ و باڤێ خوە وسا ژی خێرا کالك پیرەکێ خوە (داپیر و باپیرێن خوە). و پاشێ

---

[1] ئێزدییێن ئەرمەنستان و گورجستانێ دبێژنە "تەریق" بۆنا دوناڤ، بۆنا روحانی یانی پیر و شێخا.

[2] ستێر ژی جیێ پیرۆز د مالا ئێزدییێن ئەرمەنستانێ دەیە. جیێ، کیدەرێ گەلەك جارا ژی تشتێن زیارەتی ژی خوەیی دکن و ستێر وەك ئۆجاخ، وەك زیارەت تێ حەساب کرن.

تمام بەلاڤ دبوون و دچوونە مالێن خوە، خوە هازر دکرن، کو سبەترێ ئەیدا خوە دەرباس کن.

ب دیتنا من، ئارمانج ژ ڤێ تۆپبوونێ ژی ئەوە کو بێهتر ئێزدی دگەهنە سەرهەڤ و وان ب هەڤ رە گرێددە، تفاقا وان قەوین دبە. نە تەنێ فکرێ دینی تێ دە هەیە، فکرێ جڤاتی ژی هەیە.

سەرەخوەشی. شەڤ — بەربانگا ئینییێ ئێزدیێن ئەرمەنستانێ دچن مێڤانداریا هەڤ و پێشییێ دە دچنە سەرخوەشییا مرییێ کێ هەیە، مرییێ تەزە و سەرخوەشی ددنێ. شوون دە دچنە مالا مەری و جینارێن خوە.

خەیداندك. دلێ کێ ژ کێ مابوو، خەیداندك ناڤبەرا وان هەبوو، وێ رۆژێ ئەو تەریق دچوو مالا وی ژی، دگۆت: "دە وەرن، هەموو تشتا بیر کن، ئەڤ رۆژ رۆژەکە ئەزیزە، تەریق ژی وە را دبێژە، کو هوون ئەو مەنا خەیداندنێ داینن ئالیکی، بیر بکن بۆیی خاترێ ڤێ رۆژا ئەزیز. "ئەوانا ژی، بۆیی خاترێ رۆژا ئەزیز و وسا ژ بۆیی خاتر و حورمەتا تەریقێ ل هەڤ دهاتن، دیسا دبوونە پسمامێ هەڤدوو، ئەیدێ هەڤ پیرۆز دکرن، دچوونە مالێن هەڤ و ب هەڤ رە روودنشتن.

د رۆژێن ئەزیز دە ئێزدی گەرەکە هەموو تشتێن خراب بیر بکە، ب بەخشینە تماما کرن و گۆتنێ وانێ خراب. ئێزدی گەرەکە ب ب دلێ پاقژ و تەمیز، ب فکرێن قەنج و کرنێن باش وان رۆژێ ئەزیز قەبوول کە و وسا ژی ڤەرێکە.

ئار. جەم ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ بەرێ ( و نها ژی) ئادەتەکی وسا هەبوو" گوندی ل گوندان ئەسەسەیی گەرە رۆژا خدر نەبی، ئێڤارێ خلاسبوونێ، سبێ ئەیدە، ئێزدی تانی ئەو خانییێ خوە، کیدەرێ نان چێ دکن (تەنوورێ)، تینن نیشانا خدر نەبی لێدخن. تەمامێ پێ ئار دەق دکن. یان ژی بان پێ ئار سپی دکرن، دەق دەقی دکرن. سەر ستوونا شکل چێ دکرن ب ئار. وسا ژی دیوارێ تەنوورێ ب شکلێن زارۆکان و مەری دنەخشاندن. هەر وسا ژی

تەولەیێن دەوارا و کۆتانێن پەزی ب شکلێن حەیوانان وبەرخ و جووجکێن مریشکان و هتد دنەخشینن. پیر رزایێ کاکێ وسا تینە بیرا خوە:

" مە شکلێ مریشکا، بەرخا، قازا و تشتێ مایین چێدکرن. قازێ مە توونەبوون، مە دگۆ:"بسە ئەمێ قازا چێکن، برا قازێ مە ژی هەبن." مە مەری چێدکرن. مە دگۆ:"بسە، ئیسال برا وەزیرێ مە را کور ببە!" مە ناڤێ ستوونا داتانی: ئەڤا ستوونا گەرۆ یە. برا دەه زارێ گەرۆ هەبن! مە دەه مەری چێدکرن سەر وێ ستوونێ. دێ و باڤێ مە ژی ئاری مە دکرن. پاشێ ئەو دچوون، ئیژا مە دەست پێ دکر، تمام: دیوار، بان، ستوونە، مە ئەوانا دەڤا و نەخشا دە وندا دکر."

ئەڤ ئادەت پر ژ بیر و باوەرێن پەیدابوون و دەرباسبوونا ژیانێ یە. ئێزدیێن ئەرمەنستانێ ئەڤان دەران ب ئاری دنەخشینن، ب وێ ئارمانجێ کو زارۆك د مالێ دە چێبن و بەرهەمێ تەرش و تەوالی و زێدە بە. ئەو نەخش و نیشانێن خوەستنا دلێ مرۆڤانە بۆیی زێدەبوونا مالێ ژ وان خودانا.

**تۆتکا شۆر**. تشتەکی کو وسا ژی گەلەك ئەجێبە: د ڤێ جەژنێ دە ل ئێڤارا بەرێ جەژنێ ل جەم ئێزدیێن ئەرمەنستانێ ل شەڤا بەرێ ئێنییێ و ل جەم ئێزدیێن ئیراقێ رۆژا پێنجشەمێ خۆرت و قیز تشتێ گەلەك شۆر دخون، ئێزدیێن ئەرمەنستانێ دبێژنە "تۆتکا شۆر" و ئاڤێ ڤە ناخون و شووندا ل سەر رادزن. "تۆتکا شۆر" گەرە قیزا ئازەپ چێکە، بدە کێ دخوازە بزەوجە، کێ دخوازە مێر کە. ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ وسا باوەر دکن کو د خەونێ دە، کی ئاڤ بدە کێ ئەوێ ببە دەرگیستییێ وێ یان دەرگیستییا وی. ل جەم ئێزدیێن ئیراقێ، ترکییێ و سوورییێ ژی "توتکا شۆر" چێناکن.

**پۆخین**. شەڤا بەرێ جەژنێ ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ "پۆخینێ" (ئێزدیێن ئیراقێ و سوورییێ دبێژنێ: "پێخوون") یان ژی ئار دکنە ئامانەکی و داتیننە پشت دەرچکا مالێ. ئێزدیێن ئەرمەنستانێ ژی گەلەك جارا داتینن بەر ستێرێ.

ئێزدیێن ئیراقیێ، سوریه و ترکییێ د ڤێ جەژنێ دە پێخوونێ دکنە ئامانەکێ و دبنە قولنچکا مالێ. ئەوانا باوەر دکن کو ب شەڤێ خدر نەبی و خدر ئەیلاس سەر هەسپێ خوە بێن مالا وان و ل سەر پێخوونێ نیشانەکە خوە بهێلن.[1] لێ ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ وسا فکر دکن کو هەسپێ خدر نەبی ل سەر وێ پۆخینێ (یانێ ل سەر ئار) شۆپا نالا خوە بهێلە. جارنا ژی باوەر دکن، کو خدر نەبی موویەك ژ پۆچا هەسپێ خوە ل سەر ڤێ ئامانێ بهێلە. بڤی جوورەیی دزانن، کو خدر نەبی هاتییە مالا وان. ئەڤ تشتەکی پیرۆزە و نیشانا خێر و بەرەکەتێ یە ژ وێ مالێ را.

ئێزدیێن ئەرمەنستانێ دگۆتن، کو رۆژا سسیا، رۆژا ئێڤارا — ئەرەفاتێ، ئار داتینن بەر دێری (یان ژی بەر ستێر) و دگۆتن، وەکی خدر نەبی بێ، دەوسا سمێ هەسپێ خدر نەبی وێ بێ کفشێ سەر ئار، یان ژی پۆرەکە (مووکی) هەسپێ وی وێ بکەڤە وێ دەرێ. وەکی وسا نە، خێر و بەرەکەتا وێ مالێ هەبە، چمکی نگێ هەسپێ خدر نەبی لێ کەتییە. گەلەکا سالخ دکرن، وەکی مالا فلان کەسێ دا، سبێ رابوونە بەربانگێ، دێنا خوە دانێ، دەوسا سمێ هەسپا خدر نەبی تێ کفشێ، یانێ ژی پۆرەکە هەسپێ، مووکی هەسپێ کەتییە سەر ڤی ئاری. وەکی دگۆتن، هنگێ ئێزدی باوەر دکرن، دگۆتن:"نەهاتییە." دچوو مالا کێ، دگۆتن:"وەکی وسا نە، خێر و بەرەکەت وێ هەبە، رزقێ وێ مالێ وێ گەلەك بە، وێ دووریێ شەر و پەشکا بن." و گومان و باوەرییا گشکا ژی هەبوو، کو وێ رۆژەکێ ژی خدر نەبی ببە مێڤانێ وان و وان رە بینە هەبووکێ، ساخلەمییێ و بەختەوەرییێ.

### رۆژا ئەیدێ

دچنە بەر ب کانییێ. بەرێ ئادەتەکە وسا ژی جەم ئێزدیێن ئەرمەنستانێ هەبوو: سبێ زوو رۆژا ئینییێ کەچ و ژنێن جوان دچوونە ئاڤێ بەر ب کانییێ. رۆژا ئەیدا خدر نەبی ئاڤا کانی چا پیرۆز دهات هەساب کرن. هەر کەچکێ دخوەست بەر ب کانی ئەول بێ: هنگێ باوەر دکرن، کو ئەو مالباتا وێ بەختەوار بە. ب ڤێ

[1] بنر. خەلیل جندی رەشۆ و خانا ئۆمەرخالی.

ئاڤێ سەر چاڤێ خوە دشووشتن و ئەو ئاڤ هەر نەفەرێ مالێ ڤەدخوار. ئەو ئاڤا تێ حەسابێ چاوا نیشانا ساخلەمییێ، سەحەت–قەوەتێ و بەختەوەرییێ.

**مێڤان، پیرۆزکرن.** ئەیدا خدر نەبی ئێزدی حملی سبێ زوو دچنە مالێ هەڤ، دچنە دەست – رووییێ هەڤ، ئەیدێ هەڤ بمبارەك – پیرۆز دکن، تەختە حازر دکن، خوارن و ئەمەکێن جورە جورە حازر دکن. پاشێ، سبێ زوو، مێرێن (زەلامێن) گوند، تۆپ–تۆمەری ل مالا شێخ یان ژی پیرێ گوند دە (وێ مالێ دە، کی دەرێ کۆم دبوون و ئێڤارا ئەرەفاتێ دەرباس دکرن) دیسا کۆم دبن، دچن سەرێ خوە بەر ئۆجاخێ – ستێر داتینن (بەر ئۆجاخێ تیبیا دبن)، روودینن، دخون – ڤەدخون، گوهدارییا قەول و بەیت و دوعا، دڕۆزگا دکن.

بەری رابوونێ مالا تەریقێ دە ئەو جمئەتا تۆپبوویی گلییێ خوە د کرنە یەك، کو چا و چ جوورەیی هەرن – بگەرن تەمامیا مالێن ئێزدیێن گوند و پیرۆز کن ئەیدێ وان. پاشێ رادبوون و هەتا ئێڤارا تەری ناڤ گوند دگەریان. ئەسسەیی تەمامیا ئێزدیان دچوونە مالێ هەڤ، ئەیدێ هەڤدوو پیرۆز دکرن.

ئەڤ عەدەتا، هەلبەت، تفاقا ئێزدیخانێ قەوین دکر و ملەت ژی هێ بێهتر حژ دینێ خوە دکر.

**ستێر.** کەنگێ ئێزدی دهاتنە مالا تەریق، پێشییێ سەرێ خوە بەر ئۆجاخ، بەر ستێر خوار دکرن، سەرێ خوە بەر ئۆجاخێ داتانین، ماش ژی داتانین بەر ستێر.

**قوربان.** جەم ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ د ڤێ جەژنێ دە حەیوانەك ئەسسەه وەك قوربانی سەر ژێ دکن. هەر مالەك گەرە حەیوانەك (پەزەك) سەرژێکە. لێ جەم ئێزدیێن ئیراق و ترکییێ د ڤێ جەژنێ دە قوربانیدان قەدەغەیە، چمکی باوەر دکن کو خدر نەبی و خدر ئەیلاس د ڤان رۆژان دە ل نێچیرێ دگەرن.

**خاچ.** ئێزدیێن ئەرمەنستانێ گۆتنەکە وان هەیە: "رۆژێن لاپە سەرما دکەڤنە رۆژێن ئۆرتا خاچ و خدر نەبی." [1] پێ قرارا باوەرییا ئەرمەنییان، چەند رۆژان بەری رۆژێن خدر نەبی، سەروەرێ دینێ تەمامییا فلا (ئەرمەنییان) — کاتۆلیکۆسێ وان خاچێ داڤێژە ئاڤێ — ئەڤ ژی جەژنەکە فلایە، کو چەند رۆژا بەری رۆژییێ خدر نەبی تێ دەرباس کرن. جارا، وەختێ مەزنێن ئێزدیان هەساب دکرن رۆژێن رۆژییێ خدر نەبی، دگۆتن: " کا بزانبن فلە وێ کەنگێ خاچێ باڤێژنە ئاڤێ؟ گەرەکە رۆژییێ خدر نەبی ئەسسەهـ بکەتانا پاشی ئاڤێتنا خاچێ فلا ئاڤێ دا." وسا ژی مەزنێن ئێزدیان د گۆتن، کو "رۆژییێن خدر نەبی گەرەکە نە کەڤنە بەر ئەیدا — جەژنا مەخینا"، ژ بەر کو ئەیدا وان ژی دکەڤە مەها سباتێ.

**بەرجۆلان یان بنداروکێ.** بەرێ ل گوندان، ئێزدیێن ئەرمەنستانێ عەدەتەک ژی هەبوو، ژێرە دگۆتن "بەرجۆلان". هنەک ژی دبێژن "بنداروکێ." ئێڤارا ئینییێ، خۆرت و قیزێن گوند کۆم دبوون چەند مالا دا، خانییێ کێ مەزن بوو. جۆلان گرێ ددان و بەر و دۆرا وێ جۆلانێ تۆپی سەر هەڤ دبوون و دۆر ب دۆر خوە دکەلان، کلام دگۆتن، هەڤ رە شا دبوون و هەڤەکی درەنگ بەلایی مالێ خوە دبوون. تەڤی کەچکا تەنێ نەدچوون. لێ دەرباسکرنا وێ رۆژا (بەرجۆلان-بنداروکێ) شابوونەکە گەلەکی پڕ خوەش بوو بۆنا خۆرت و کەچێن گوندان. ئەو رۆژا دبوو مانە و گەلەک کەچ و خۆرتان، کو هەڤ بئەجبینن، خوەستنێ دلێ خوە، ب تەحەرەکی هەڤ رە بێژن.

**دۆلیدانگ.** د ڤێ جەژنێ دە بەرێ عەدەتەکە وسا ژی هەبوو کو شەڤا بەری جەژنێ، زارۆکێن گوند ل ئەرمەنستانێ گۆرێن ژ هرییێ ڤەهوونانـدی و رەنگێن نەخشدایی هلددان و ناڤێ وێ گۆرێ دۆلیدانگ (یان هۆلیدانگ) بوو، ب تێلەکە درێژ ڤە گرێددان و دچوونە سەر بانێ مالا جینارا و د کولەکێ را ئەو دۆلیدانگ بەرددانە خوارێ و پێ را سترانەک دگۆتن:

---

[1] ب گۆتنێن پیر رزایێ کاکێ.

**دۆلیدانگیێ، دۆلیدانگیێ،**
**خوەدیێ خوەیی کە خۆرتیێ مالێ.**
**پیرە مالێ بکە قوربانگیێ:**
**تشتەکی باڤێژە دۆلیدانگیێ.**[1]

یان ژی وسا دگۆتن:

**دۆلی- دۆلیدانگیێ،**
**سەریێ پیریێ قوربانگیێ،**
**خۆرتیێ مالێ زەڤانگیێ،**
**کانیێ دۆلیدانگیێ.**[2]

خەلکێ ویێ مالێ ژی ئەو گۆرە ب تشتێن شیرین ژ شەکر، قەیسی، سێڤ، و مێویژ تژی دکرن وەك پێشکێش و زارۆکان دۆلیدانگ جارەکە دی هلددان و ب شابوونەکە مەزن دچوونە سەر بانەکی مایین.

وەکی مەری تشتەك نەدا ئەو گونەهەکی مەزن بوو، لێ هەر کەس ئەسەیی تشتەك ددا. زارۆکێ گوندان، ل ئەرمەنستانێ، بێ سەبر، هەر سال هێڤییێ بوون، کا ویێ کەنگێ رۆژێن خدر نەبی بێن و ئەوانا ب شابوونەکە مەزن دۆلیدانگا خوە بگەرینن و پێشکێشی خوە رە تۆپ کن.

ئەڤ ئادەت ل جەم ئێزدیێن ئیراقێ، ترکییێ و سورییێ تونە.

هەسپێ خدر نەبی. ئێزدیێن ئەرمەنستانێ باوەر دکن، کو خدر نەبی د ڤێ دنێ دە ل سەر هەسپێ سپی یێ فرینە دگەرە. د شەڤێ بەری جەژنێ دە کەسەك دەری نەدگرت، چمکی هێڤییێ بوون وەکی خدر نەبی بێ مالا وان.

[1] ب گۆتنێن پیر رزایێ کاکێ.
[2] ب گۆتنێن پیر قاناتێ کاکێ.

وەکی مەری دکەتنە تەنگاسیییێ، دگۆتن:"خدر نەبی، تو وەرە هەوارا من."
وەك میناك ژی جارنا وسا دگۆتن:" هەوارا مە خدر نەبی، خدر لیاس، سوارێ هەسپێ بۆز."

ئێزدیاتی وارێ رێ و رسمان دە گەلەك دەولەمەندە. ئێزدی ل گۆر عەدەتێن دینی یێن کەڤن دژین و هەتا نها ژی، کو ئێزدی تەڤایێ دنیایێ دە بەلاڤەبوویی نە، پرانییا وان پەیی دینێ قەدیم کو دێ و باڤێ وان ژی ئەو دحەباندن، دچن.

**ببلیۆگرافییا:**


خانا ئۆمەرخالی. جەژنا خدر نەبی و خدر ئەیلاس جەم ئێزدیێن ئەرمەنستانێ، ئوورکێش. هەژ.١. گاڤلە، سوێد، ٢٠٠٦. ر. ١٦–٢٨.
خەلیل جندی رەشۆ و خانا ئۆمەرخالی. ئەیدا خدر نەبی و خدر ئەیلاس//دەما نوو. هەژ. ١٤٢. وەپپەرتال. ٢٧ سبات ٢٠٠٦.

## فەرهەنگۆکا تێرمێن ئێزدیاتییێ

**ئادانی**– ناڤێ مالەکە شێخانە، کو یەك ژ سێ مالێن شێخانی (بنر. شێخانی) یە. دو مالێن دن ژی قاتانی و شەمسانینە.

**برێ ئاخرەتێ** – یەك ژ پێنج فەرزێن هەقیقەتێ یە (بنر. پێنج فەرزێت هەقیقەتێ). گەرەك برێ ئاخرەتێ هەر ئێزدیەکی هەبە، یان شێخ (بنر. شێخ) یان ژی پیر (بنر. پیر) دکارە ببە.

**جلڤە (جەلوە)**– یەك ژ کتێبێن پیرۆز یێ ئێزدیانە. کتێبا دودا یا پیرۆز ژی تێ ناڤکرنێ وەك "مسحەفا رەش."

**چارشەما سۆر**– یەك ژ جەژنێن هەری مەزن جەم ئێزدیانە، کو مەها نیسانێ دە تێ دەرباس کرن. ئەو جەژن وەك جەژنا سەرسالێ و جەژنا "تاووسی مەلەك" ژی تێ ناسکرن.

**ئەیدا ئێزید** – یەك ژ جەژنێن هەری فەرز و مەزن جەم ئێزدیێن هەموو دنیایێ. ئەو دکەڤە رۆژا ئینییێ و مەها کانونێ یەکێ تێ دەرباسکرن. سێ رۆژ بەری جەژنێ ئێزید بۆنا خوەدێ (ئێزید) رۆژی دگرن.

**ئێزدی** – ناڤێ ئێزدیان راستینی یە، کو ئەوانا خوە را خوە خوە دبێژن و بن ڤی ناڤی دە خوە ناس دکن.

**ئێزدیخانە** – ئێزدیێن سۆڤیەتا بەرێ، ژ بۆ ناڤکرنا تەڤاهیا گەلێن ئێزدیان، تێرما ئێزدیخانەیێ ب کار تینن، یانی هەموو ئێزدی.

**لالش** – زیارەتا هەموو ئێزدیانە. گەلییێ لالشێ ل کوردستانا ئیراقێ یە، دکەڤە دەڤەرا شێخانێ (وەلات شێخێ). ئێزدی "لالش"ێ ب ناڤ دکن وەك "لالشا نوورانی."

**مال** – بنر. ئۆجاخ.

**تاووسێ مەلەك** (مەلەکێ تاووس) – سەرۆکێ هەموو سەرمەلەکانە. بەری ئافراندنا دونیایێ خوەدێ ئەو وەك یەکەمێ هەر هەفت سەرمەلەکان ئافراندی یە:

"رۆژا ئەول، یەکشەمیێ، خوەدیێ، مەلەك ئەزازیل ئافراند و ئەو تاووسێ مەلەکە، سەرەکیێ هەموویان"، "... و وی مەلەکیێ تاووس کر سەرۆکیێ هەموویان."

**مەسحەفا رەش** – یەك ژ کتێبێن پیرۆز و قەدیم یێن ئێزدیانە. کتێبا پیرۆز یا دینی ژی تێ ناڤکرنێ وەك "جلڤیێ."

**مریدخانە** – ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ ژ بۆ تەڤایا مریدان تێرما مریدخانەییێ ب کار تینن.

**ئۆجاخ** – ژ بۆ پێناسەکرنا مالێن ژ کاستێن رووحانی (پیر و شێخان)، تێرما "ئۆجاخ" تێ بکارئانین. وسا ژی "مال." ئۆجاخێ پیر و شێخان وەك زیارەت تێنە قەبوول کرن ناڤا ئێزدیخانێ دە.

**پێنج فەرزێت هەقیقەتێ** – ئەساسێ ڤان پێنج فەرزان ئەوە کو دڤێ هەر ئێزدییەکی\ێ پیر، شێخ، هۆستا (هۆستاییێ روحانی)، مەرەبی (مامۆستاییێ رووحانی) و بریێ ئاخرەتێ و /ئان ژی خوشکا ئاخرەتێ هەبن تەڤ وەزیفەیێن وان ئێن دیار. ئەوانا دڤێ قانوونێن ئێزدیاتییێ فێری وی/ ویێ بکن. لێ ژ هەموویان موهیمتر، دڤێ ئەو، مەراسیمێن سەبارەت ب رووداننێن سەرەکە د ژیانا ئێزدییەکی/یێ دە ب ریێ ڤە ببە و بەشدارییێ لێ بکە.

**پیر** – ناڤەکی مجێورێن مالێن (کاستێ) روحانییا د ئۆلا ئێزدیاتییێ دە. ئێزدی ژ کاستێ پیرا. هەر وسا ژی یەك ژ فەرزێن ئێزدیانە (بنر. پێنج فەرزێت هەقیقەتێ).

**پیرانی** – ئێزدیێن ئەرمەنستانێ و گورجستانێ ژ بۆ ناڤکرنا تەڤایا پیران تێرما پیرانی ب کار تینن. یانی هەموو پیرا.

**قاتانی** – ناڤێ مالەکە شێخانە، کو یەك ژ سێ مالێن شێخانی (بنر. شێخانی) یە. دو مالێن دن ژی تێنە ناڤ کرنێ وەك ئادانی و شەمسانی.

**سێ حەرف** – سێ گونەهێن مەزن جەم ئێزدیان: شەلبکێ زێرین (تەریقا نەستینن و زندەقی نەکن)، دیزا دەنێ (دینێ ماین قەبوول نەکن)، دەربا خەرقە (دەستێ خوە بلند نەکن سەر تەریقا و سەر فەقیرا).

**شەمسانی** – ناڤێ مالەکە شێخانە، کو یەك ژ سێ مالێن شێخانی دێ ڤێ مالێ ئێزدینا میر بوو – هەر وسا باڤێ چار کورا بوو: شێشمس، فەخرەدین، سجادین و ناسردین.

**شێخ** – ناڤەکی مجێورێن مالێن (کاستێ) روحانییا د ئۆلا ئێزدیاتییێ دا. ئێزدی ژ کاستێ شێخا. هەر وسا ژی یەك ژ فەرزێن ئێزدیانە (بنر. پێنج فەرزێن هەقیقەتێ).

**شێخانی** – ئێزدیێن سۆڤیەتا بەرێ، ژ بۆ ناڤکرنا تەڤایا شێخان تێرما شێخانی ب کار تینن. یانی هەموو شێخا.

**تەریق** – ئێزدیێن ئەرمەنستان و گورجستانێ بۆنا سنفێن روحانی – پیر و شێخا رە – ب گشتی دبێژن "تەریق" ئان ژی "روحانی"، و نە ب قاسی یێن دن تێرما "دوناڤ" ژی ب کار تێ. جەم ئێزدیێن ئیراقێ "دوناڤ" بێهتر تێ بکارئانین.

**خدر نەبی و خدر ئەیلاس**– جەژنا ئێزدیایە، کو ب ناڤێ دو خودانا تێ ناسکرن: خدر نەبی و خدر ئەیلاس (ئەلیاس). خدر نەبی جەم ئێزدیان خودانێ حەزکرن و مراز حاسل کرنێ یە (مراز بەخشە)، خدر ئەیلاس ژی وەکی پشتەڤانێ ئەو کەسێن کو نەخوەشن، رێوی نە و مەرییێن گرتی (حەبسێ دە) تێ حەسابکرن.

# پارا چارەم

## قەول و مەعنابێن ئێزدیان:
## پایە و رۆلا وان، ل سەر پرسا تەحلیلا قیاسی یا ئێزدیاتی، یارسان (ئەهلێ هەق) و زەردەشتیێ

## قەول و مەعنايێن ئێزديان:
## پايە و رۆلا وان، ل سەر پرسا تەحليلا قياسى يا ئێزدياتى، يارسان (ئەهلێ هەق، كاكايى) و زەردەشتييێ [1]

### پێشگۆتن

دڤێ لێكۆلينێ دە ئەز باڵێ دكشينمە سەر مەعنا[2] و ئەفسانەيێن دينى يێن ئێزدياتييێ، كو گرنگييا وان هەتا دەرەجەيەكێ ژ ئاليێ زانيار و ئێزديان ڤە هاتيە پشتگوهكرن. من دل لێ يە ل ڤر پرسا رۆلا قەول و مەعنايان د ئێزدياتييێ دە و هەروها پايە و فۆنكسيۆنا وان لێك بدم" و نيشان بدم كو بەرى شێخ ئادى[3]، بير و بۆچۆنێن كو ئەم د قەولان دە پەيدا دكن ب فۆرما ئەفسانەيان مەوجوود بوون. پاشى، ل سەر بنگەهێ وان گەلەك قەولێن دينى يێن هەلبەستى هاتنە دورستكرن. هەروها د ناڤ پارێن لێكۆلينێ دە ئەز دێ هنەك تەكستێن دينى يێن ئێزديان (قەول و مەعنا)[4] پێشكێش بكم" و د ناڤ چارچۆڤەيا رێبازا قياسى (كۆمپاراتيف، بەراوەردى) دە، ڤان تەكستێن دينى ل گەل تەكستێن دينى يێن هەردوو دينێن خزمێن ئێزدياتييێ، ئانكو ل گەل ئەهلێ هەق و زەردەشتييێ قياس بكم و هەول بدم كو بنەتار و گرينگييا مەعنايێن ئێزديان ئيسبات بكم" هەروها

---

[1] ئەڤ لێكۆلين، ل سەر بنگەها گۆتارەكە من ئا كو د سەمپۆزيووما ناڤنەتەوەيى "Non-Islamic religions in Iran: a "non-essentialist perspective دينێن خەيرى – ئيسلامى ل ئيرانێ: پەرسپەكتيفەكە نۆن – ئەسەنسياليست". گۆتينگێن (ئالمانيا)، ٦–٧ حەزيران ٢٠٠٨ ئان دە هاتيە پێشكێشكرن. سەمپۆزيووم ب سپۆنسۆريا Graduiertenkolleg "Gotterbilder – Gottesbilder – Weltbilder" ب رێ ڤە چوويە. ئەو گۆتار ل گۆڤارا زەند (ئيستانبۆل، ٢٠٠٨، ڕ ٦١–٧٣) هاتيە چاپكرن.

[2] پرس، شيرۆڤە.

[3] موسلحێ ئێزدياتيێ، سەدسالێن ١١ و ١٢.

[4] من پرانيا وان د هەنگاڤا لێكۆلينێن خوە يێن قادێ دە ل ناڤ ئێزدييێن ئەرمەنستان (٢٠٠٧) و ئيراقێ (٢٠٠٨) بەرهەڤ كرنە.

گرینگییەکە تایبەت دیٚ ل سەر رۆنکرنا پرسا ئالۆز ئا پەیدابوونا ئێزدیاتییێ و پاشخانەیا ویٚ یا هەڤبەش ل گەل ئەهلیٚ هەق و زەردەشتییان بە.

**پەیدابوون.** لایەنگرێن ئێزدیاتی، زەردەشتی و ئەهلیٚ هەقان (ناڤێن کو ئەو ددن دینێن خوە ئێزدیاتی، یارسان[1] و مازدایەسنا نە)، نسبەتەن ژ هەڤ دوور دژین[2] و ب ئیحتیمالەکە مەزن چ تەماس و تێکلداریەکە نێزیك نەبوو د ناڤبەرا وان دە. ل گەل ڤیٚ هندیٚ ژی ترادسیۆنێن وان ئێن دینی پر رەنگیٚ یەك و دو ددن (وەك هەڤن): هەژمارەکە ئەلەمەنتێن وان ئێن هەڤبەش هەنە، (ب تایبەتی کۆزمۆگۆنی و ریتووەلێن وان پر مینا هەڤن) کو دهێلن ئەم بەحسا بنگەهەکە هەڤبەش ئا موحتەمەل بکن ژ بۆ ڤان دینان.

دیرۆکناس و لێکۆلینەرێن هەتا نها پیٚ چێنەبوویە بگەهنە قەناتەکە تەتمینکار سەبارەت ب بنەتار و پەیدابوونا ئێزدیاتییێ. زانیاریٚ فرەنسی ر. لێسکۆ[3]، د کتێبا خوە یا ل سەر ئێزدیێن سووریەیێ دە، ل پەیی بیرا م. ئا. گودیدییێ ئالمیٚ ئیسلامیٚ و نڤیسکاریٚ هیپۆتەزەکە ل سەر بنەتاریٚ ئیسلامی ییٚ ئێزدیاتییێ دەردبرە. ب. نیکیتن[4] نە ل گەل ڤیٚ فکریٚ یە و ب دیتنا وی ئێزدی چ جاران

---

[1] ژ ڤر و پیٚ دە د ڤیٚ لێکۆلینیٚ دە ئەز دیٚ ب ناڤیٚ کو باوەرمەندێن دینی ژ بۆ دینیٚ خوە دبێژن، ئانکو ناڤیٚ یارسان ب کار بینم.

[2] ئێزدی ئیرۆ پرانی ل ئیراق، رووسیا، ئەرمەنستان، گورجستان، ئالمانیا، سووریە، و وەلاتێن دن دژین. ئەهلیٚ هەق پرانی ل ئیرانیٚ دژین: ل ئەیالەتێن کەرمانشاه، هنەك قەزایێن لاکستان، لورستان، ل ئەیالەتا ئازەربەیجان ئا ئیرانیٚ، ل خۆرستانیٚ، و هەروها ل کوردستانا ئیراقیٚ دژین کو ل ویٚ دەریٚ وەك کاکەیی تێنە ناسین، و ل تورکییە ژی دژین. زەردەشتی پرانی ل ئیرانیٚ دژین، پشکا پتریٚ وان ل یەزد و هندستانیٚ. پارسێن (کو ناڤیٚ وان تیٚ واتەیا "پەرسیایی–ئیرانی") کو شێنییێن گوجاراتیٚ نە، ژ عەسلیەتیٚ زەردەشتیێن ئیرانیٚ نە کو د ناڤبەرا سەدسالێن ۸ و ۱۰ ئان دە ژ بەر زولما موسولمانان کۆچ کرنەویٚ دەریٚ.

[3] Lescot R.1938.

[4] نیکیتن ب. ١٩٦٤.

نەبوونە موسولمان. ن. ی. مار[1]، ئەندامێ دائیمی یێ ئاکادەمییا زانستان، وەسا دفکرە کو پرانییا کوردان بەری ببنە موسولمان باوەری ب دینێ ئێزدیاتییێ دانین. ب باوەرییا هەژمارەکە لێکۆلەران، دەستپێکا ئێزدیاتییێ دگهە جوهوودیتی (یەهووداتی)، باوەرییێن کەڤن ئێن ئیرانی، خریستیانی و ئیسلامێ. هنەکان بەحسا عەسلیەتا ئەرەب ئا ئێزدیان کرییە. لێ بەلێ بۆچۆنێن هەری خەیالی ژ نڤیسکارێن ئەرمەنی یێن سەدسالا ۱۹ئان دهاتن، کو ب یا وان، ئێزدی، ئەو "کافر" بوون یێن ژ دێرا ئەرمەنی دەرچۆیی.[2]

گەلەك راستییێن زمانی، دینی و دیرۆکی رێ ددن کو ئەم ئیددیا بکن کو بۆ زەمانەکێ تەمسیلکارێن کولتورێن کەڤن ئێن هندی و ئیرانی ب هەڤ رە یەك کۆم بوون، ب ناڤێ جڤاکا هند – ئیرانی. گەلەك ئەلەمنتێن مانەند ئێن دینێ ڤێدیك، زەردەشتییا پێشی و ئێزدیاتییێ دهێلن کو ئەم فەرز بکن کو د بنگەها ئاڤاهیێن ڤان سیستەمێن دینی دە فکرێن قەدیم ئێن هند – ئیرانی، وەکی یێن هند – ئارییایی، هەنە. مانەندییێن (وەکهەڤی) د ناڤبەرا دینێن (ئان ژی ترادسیۆن) ناڤبۆری دە، وەکی رێنەدانا هەلگرتنا ڤان دینان، دابەشبوونا جڤاکێ ل سەر بنگەها پرەنسیبێن چینی و دینی (یانی کاست) و قەدەغەیا زەواجا ئەندامێن کاستێن جهێ (د زەردەشتییێ دە، رەنگە د سەفحەیا پێشی دە)، د تەنێ چەند ژ وان مانەندیانن.

دناڤ چارچۆڤەیا لێکۆلینێن دینی یێن هەڤچەرخ دە، مرۆڤ دکارە دیاردەیەکە وەسا نوو وەك بەرژەوەندییا لایەنگرێن هەرسێ دینان بنرخینە:

دناڤ ئێزدیان دە هنەك کەس هەنە کو ژ بۆ خوە ئیددیایا زەردەشتییێ دکن و خوە زەردەشتی دناسن. هەتا ب ناڤێ "قەولێ زەردەشت"[3] قەولەکە نوو هاتبوو دورستکرن. ب دیتنا من، ئەڤ یەك تێکلدارە ل گەل پرسا زاناڤێ (هوویەت)، کو ب تایبەتی د ناڤ نفشێن جوان ئێن ئێزدییێن ل دیاسپۆرایێ دە مەسەلەیەکە پر گرینگە.

---

[1] مار ن. ی. ۱۹۱۱: ۹۹ – ۱۵۱.

[2] Menteshashvili A.M., 1984: 196.

[3] "قەولێ زەردەشت" د کۆڤارا "لالش" دە هاتە بەلاڤەکرن. هەژ. ۱۵، بیلیفیلد. ۲۰۰۱.

زەردەشتییێن هەڤچەرخ، پرانی ل بریتانییا و ئەوروپا، مەیل و ئەلاقەیەکە زۆر ددنە سەر ئێزدیاتییێ.[1]

هنەك کاکەییێن (ئەهلێ هەق) ئیراقێ جارنان دبێژن کو ئەو بەرێ ئێزدی بوونە (ئان ژی گەلەك نێزیکی ئێزدی نە).

گەلەك موناقەشەییێن سەبارەت ب پەیدابوونا ئێزدیاتییێ هەتا ئیرۆ هاتنە، ل گەل ڤێ هندێ ژی، لێکۆلینەران پێ چێنەبوویە بگەهنە قەناعەت تەتمینکار ل سەر مەسەلەیێ. د ناڤبەرا ئێزدیاتی و زەردەشتییێ دە هنەك مانەندی هەنە، وەك: مەراسیمێن دینی" نیشانەیێن تایبەت (کراسێ سپی ب ناڤێ سودرە (زەر.)، تۆکا ئێزید (ئێزد.) و ل گەل بەریکا هوورك ئا ژێ رە گریبان (زەر.) دبێژن، بەرستووکەکە گرۆڤەر ئا ب ناڤێ گریڤان (ئێزد.))" باوەرییا د روحێن پێشییێن (جد) کری دە، کو ئەو پێشی (جد) د دنیایا دیتر دە پارێزڤانییا ئێلا وان دکن" جەژنەك دەما ئەو پێشییێن مری تێن سەر دنیایێ (زەر.)" جەژنێن پاییزێ عەیدا جمایێ (ئێزد.) و جەژنا مێهرەگان (زەر.) ل گەل قوربانکرنا گایەکی، هتد.

تێکستێن دینی یێن ئێزدیان. هەرسێ ترادیسۆن ژی خوەدییێ کوللیاتێن فرەه ئێن تەکستێن هەلبەست و پەخشانێن پیرۆزن کو ب دەڤکی داهاتنە. تەکستێن دینی یێن سەرەکە د ڤان هەموو دینان دە سروودێن دینی نە، وەك قەول (ئێزد.)، کەلام (یار.)، گاتا[2] (زەر.) تێن بناڤکرن. ب فۆرمێن هەلبەستی هاتنە دورستکرن و د هەنگاڤا هەلکەفتێن دینی دە ب شێوەیەکی تایبەت تێنە خوەندن.

دناڤ نڤیسێن سەییاحان دە بەحسا هەبوونا کتێبا پیرۆز ئا ئێزدیاتییێ دهاتە کرن و گەلەك رۆژئاڤاهیان هەول دا وێ پەیدا بکن. ژ ١٨٨٠ ڤە نوسخەیێن دو کتێبێن ئێزدیاتییێ، کو ب ئەرەبی بوون، دەرهاتن. پشتی وێ د سالا ١٩١١ دە،

---

[1] د حەزیرانا ٢٠٠٥ ئان دە، "World Zoroastrian Organization"( رێخستنا زەردەشتیان ئا جیهانی) (WZO) ئەز داوەت کرم بۆ بریتانیا مەزن (لۆندۆن) دا کو سەمینەرەکێ ل سەر ئێزدیاتی و زەردەشتییێ بدم.

[2] ب یا گۆتنێن د. ساراه ستووارت (٢٠٠٨\٦\٦، گۆتینگێن)، نها باوەرمەندێن زەردەشتییێ دبێژن:" کتێبا مە گاتا یە و مەزهەبێ مە ئاڤەستایە."

پەدەرێ كەرمەليت[1] ئاناستاس مارييێ قاشۆ ڤەرسيۆنێن رەسەن ئێن ب كوردی يێن كتێبێن پيرۆز ئێن ئێزديان، كو ب ئالفبێيەكە خەريب هاتبوون نڤيسين، وەشاندن. د ناڤ چەند سالەكان دە م. بيتنێر[2]، وەرگەرێن وان ئێن ب زمانێ ئالمانی بەلاڤ كرن. ژ سەدسالا ١٩ئان ڤە، گاڤا هەردو كتێبێن كو وەك كتێبێن پيرۆز ئێن ئێزدياتييێ دهاتن زانين، ئانكو "جلڤێ" و "مسحەفا رەش" هاتن بەلاڤكرن، مەيل و ئەلاقەيەكە مەزن ئا زانستی ل سەر تەكستێن دينی يێن ئێزدياتييێ بەرهەڤ بوويە. نها هەما بێژە هەموو زانيار، ژ بەر زمان و ناڤەرۆكا وان هەڤبيرن كو ئەڤ نە كتێبێن قەديم و رەسەن ئێن ئێزدياتييێ نە.[3]

ب يا باوەرييا عەدەتێ ئێزدياتييێ، ژ بەرێ ڤە كتێبەكە پيرۆز ئا ئێزديان هەبوويە و هەتا نها د مالا ئێزديەكی دە ڤەشارتی بوويە، ئان ژی هاتييە ژ بەينبرن. ئێزديێن ئەرمەنستانێ و هنەك ئێزديێن ئيراقێ ژی گەلەك جاران ناڤێ وێ كتێبێ وەك "زەبوون" (يان ل ئيراقێ "زەبوور") تينن.

ئيحتيمالە، ژ بەر كو هەموو ئێزدی ئيديا دكن كو كتێبا پيرۆز ئا وان ب خوە هەبوويە، ل گەل ڤێ هندێ كو شەوتييە ئان ژی هينا ل مالا پير ئان شێخەكی دە بێ خوەيكرن (بێ هەلگرتن)، دبە كو:

ئەڤ كتێب ب راستی هەبوو"

فكرا هەبوونا كتێبا پيرۆز ئا ئێزدياتييێ ل ژێر كارتێكرنا پەستا "اهل الكتاب"[4] (گەلێ كتێب "ئا پيرۆز") دە دەرهات؟

---

[1] كەرمەليت، تەريقەتەكە كاتۆليكە كو د سەدسالا ١٢ ئان دە ل چيايێ كارمێلێ هاتيە دانان و ناڤێ خوە ژی هەر ژ وی چيايی وەرگرتييە.

[2] Bittner: 1913.

[3] دڤێ ل ڤر ناڤێ تەكستەكە دينی يا ديتر ئا نڤيسكی ژی بينن، " مشوور". ل گۆری تراديسيۆنێ ٤٠ مشوور هەبوون. من بهيستييە كو چەند مشوور هێژ مانە، لێ بەلێ من ب چاڤێن خوە دو مشوور ديتن د مالێن پيران دە: يەك ل كوردستانا ئيراقێ و يا دن د ناڤ ئێزديێن ئەرمەنستانێ دە (يا دوييێ ب ناڤێ " مشوورا رەشبەلەك" تێ ناسين). ئەز ل سەر داخوازا وان پيران ناڤێن ئۆجاخێن وان ڤر نانڤيسم.

[4] اهل الكتاب (ب عەرەبی، " گەلێ كتێبێ–ئا پيرۆز–")، د بيرا ئيسلامێ دە ئەو ديتنێن وەك جهوويی، خرستيانی و زەردەشتی كو خوەدانێ كتێبێن سەماوی نە (بۆ نموونە، تەورات، مزگينی، و ئاڤەستا)، تێنە جوداكرن ژ وان دينێن كو كتێبێن وان نە ل سەر ئەساسێ وەحيێن ئيلاهی نە.

ب یا من ئێزدیاتی ل سەر بنگەها ترادسیۆنا دەڤکی بوو و نها ژی وەسا یە، و چاڤەرێبوونا یەك کتێبا پیرۆز، یا راستی، موهتەمەلە لێ ب ئیحتمالەکە مەزن بێنەتیجەیە. وەسا دیارە کو رێکا دورستتر ئەوە کو هەموو تەکستێن دینی یێن هەیی و راست وەك عەدەتەکە دینی بێنە قەبوولکرن. مەسەلە، ئەم ل ئاڤەستایێ بنێرن، کو یا راستی نە یەك کتێبە ئەو: ئاڤەستا بەرمایێن بڕەکە تەکستێن پیرۆز ئێن زەردەشتییێ یە.[1]

بنگەها باوەری و ریتوەلێن ئێزدیاتییێ ب گشتی د ترادسیۆنا دەڤکی دە یە، ئانکو د وێ ئەدەبیاتا دینی دە کو ب چەشنێن جهێ یێن پۆیەتیك و پەخشانا دینی شکل دگرە: قەول، بەیت، مسحابەت، دوعا و درۆزگە، تەرقین و شەهدەتیا دین[2]، و هەروها چیرۆك، چیڤانۆك، مەعنا، هتد. بکارئانینا تێرمێن جودا ژ بۆ کاتەگۆرییێن جوور ب جوور ئێن تەکستێن دینی یێن ئێزدیاتییێ، ژ بەر بکارئانینا مەخسووس ئا ڤان تەکستێن پیرۆز پر گرینگە: د موناسەبەتێن جهێ دە تێنە خوەندن. جارنان مرۆڤ دکارە ببینە کو تێرمێن "قەول" و "بەیت" ل دەوسا هەڤ هاتنە بکارئانین، لێ بەلێ ئەڤ یەك پر کێم جاران پێك تێ.

سالێن ئاخر ئێن ۱۹۷۰ئان و دەه سالێن داویی، پرانییا تەکستێن دینی د ناڤ ئێزدیێن ئەرمەنستان و ئیراقێ دە هاتنە بەرهەڤکرن و بەلاڤەکرن ژ ئالییێ بڕایێن پرۆف. د. ئۆردیخانێ جەلیل و پرۆف. د. جەلیلێ جەلیل[3]، پرۆف. د. حەجییێ جندی (ل ئەرمەنستانێ)" پرۆف. د. کرییێنبرۆك[4]، د. خ. ج. راشۆ[5]، خدر پیر سلێمان[6]، بەدەلێ

---

[1] تێ دە "ویدێوڤدات"، "ڤیسپێراد"، "خوردە ئاڤەستا"، "یاسنا" (ل گەل سروودێن دینی گاتهایان)، "یاشت". لیتەراتوورا پیرۆز ئا زەردەشتی ژی دیسا د فارسیا ناڤینی (پەهلەڤی) دە هاتیە پاراستن، کو ئەو ژی پیرۆز تێ زانین، وەکی: بونداهیشن (ئافراندن)، مێنۆگ–ی خراد (روحێ ئرفانێ)، دئێنکارد ("رەفتارێ دینی")، هتد.

[2] تەرقین و شەهدەتیا دین وەك دوعا تێن حەسابکرن.

[3] جەلیل، ئۆ. و ج. ۱۹۷۸، یێرێڤان" جەلیل، ئۆ. و ج. ۱۹۷۸، مۆسکڤا.

[4] کرییێنبرۆك / رەشۆ ۲۰۰۵.

[5] رەشۆ، خ. ج. ۲۰۰٤.

[6] سلێمان، خ./ خەلیل ج. ۱۹۷۹.

فەقیر حەجی[1] (ل ئیراقێ) و د هنەك چاڤکانییێن دن دە. ژ نها ڤە ئەم دکارن ب دلنیایی بێژن کو ئێزدیاتی د ناڤ مەرحەلەیەکە نوو یا کاودانێ (پێشکەتن) رە دەرباس دبە، واتە، دەرباسبوونا موحتەمەل ئا بۆ ترادسیۆنا نڤیسکی.

ئێزدی هەرگاڤ بترس بوونە ل همبەر نڤیساندنا تەکستێن دینی و خوە ژ ڤێ یەکێ پاش ڤە دانە. هەر چەند بەرێ ئێزدیان ژ ئەرمەنستانێ قەولێن دینی نڤیساندبن ژی (ئان ژی هشتن کو ئەز ڤێ یەکێ بکم)، ب تەنێ ب حوبرا سۆر (ئان ژی رەش) نڤیساندنە، تو جاری نە ب حوبرا شین. هنەك ئێزدیێن ئەرمەنستان و ئیراقێ باوەر دکن کو هەکە کەسەك ل تەکستەکە پیرۆز بنهێرە دبە کو کۆر ببە. ئەڤ هەموو راستی پشتراست دکن کو جەم ئێزدیان، تەکستێن دینی یێن نڤیسکی خوەدان تەبیعەتەکە تایبەت، سرِ و نەپەنی نە.

دیارە کو دڤێ ئێزدی هەتا دەمەکە نێزیك کێشەیا کانۆنیزاسیۆنا[2] تەکستێن خوە یێن دینی چارەسەر بکن. ب جیهەتا پێشکەتنا خوە یا دیرۆکی ڤە، ئێزدیاتی، د مەرحالەیێ دە مایە کو تەکستێن دینی هێژ نە هاتنە کانۆنیزەکرن. دیارە کو ژ بۆ کانۆنیزەکرنا وان دو پرسێن سەرەکە دێ پێش بێن ل بەر ئێزدیان:

کیژان تەکست دڤێ د ناڤ کولیاتا کانۆنێ دە جی بگرن.

کێ دڤێ دەست ب کانۆنیزاسیۆنێ بکە؟

ئێزدی و یارسان هەردو ئەساسەن ترادیسیۆنێن دەڤکی نە و پرسا پرۆسەیەکە ئۆرگانیزە یا کانۆنیزاسیۆنێ پر ئالۆز خویا دکە. نها د ناڤ جەمعەتا یارسان دە، خاندانێن جهێ خوەدیێ سروودێن – کەلامێن "کانۆنیك" ئێن جهێ نە و ئەڤ راستی وەك کێشەیەکە مەزنە ل بەر جەمعەتا یارسان. ب تەنێ ل ئەیالەتا کوردستانا ئیرانێ ١١ خاندان هەنە کو سەبارەت ب ڤەرسیۆنێن کانۆنیك ئێن سروودێن خوە یێن دینی (یانی کەلام) یەککگرتی نینن. پر ئاشکەرایە کو پرۆسەیەکە بێسیستەم ئا کانۆنیزاسیۆنا تەکستێن دینی یێن ئێزدیاتییێ دبە د پێشەرۆژەکە نێزیك دە جەمعەتا ئێزدی تووشی کێشەیا جەمعەتا یارستانێ بکە.

---

[1] بەدەلێ ف. ح. ٢٠٠٢.

[2] کانۆنیزاسیۆن – کتێبکرنا تەکستێن دینی کو هەموو ئێزدی وێ قەبوول بکن.

## قەول و مەعنايێن ئێزديان

**بنەتارێ قەولان.** قەولێن ئێزديان ب ڤان کەسايەتييێن هانێ رە تێنە تێکلدارکرن: شێخ فەخرێ ئاديان (ئانکو شێخ فەخرەدين)، پير رەشێ حەيران، دەروێش قاتان، بابەکرێ ئۆمەرا، هەسەدێ ئال تەوری، داودی بن دەرمان، دەروێش حەبيب، کۆچەك جەم، دەروێش قوتك، شێخ هەڤند، دەروێش تاژدين، ئابوو بەکرێ جەزيری، پير خدر، گاڤانێ زەرزا، لاوکێ پير، و بێن دن ژی.[1] د دو قەولان دە – "قەولێ بۆرێت فەقيرا" و "قەولێ سلاڤێت جارا" – ناڤێ شێخ مەند وەك دانەر و ڤەهونەرێ قەولان هاتييە.

هەر چەند نڤيسکارێن هەژمارەکە قەولێن ئێزديان کەسايەتييێن ديرۆکی و راستی بن ژی، سەبارەت ب ئۆريژينا قەولان بير و بۆچۆنێن جهێ هەنە کو هەموو ژی بەحسا ئۆريژينا سەماوی یا قەولان دکن و هەموو پێکڤە ژ ئالييێ ئێزديان ڤە وەك "ئولمێ خوەدێ" (ئان " ئولمێ خوەدێ و شيخادی") ئان ژی "بەحر" – وەك سەمبۆلا زانستييا سڕی – تێنە بناڤکرن. چەشنێن دن ئێن پۆيەتيك و پەخشانا دينی خوەدان قيمەت و حورمەتن لێ وەك سەماوی نايێن قەبوولکرن. ئێزدی دبێژن کو دەروێش، خاس و کەرەمداران ئەو قەولێن ئێزديان "ژ کەشکوولێ" يان " ژ قەنديلێ"، يان ژی " ب کەرەما خوەدێ باتنی" ئانينە. ئێزدی نها دبێژن "مە ئيمانە ژ قەولە"، "ئيمانا مە ب قەولێن شيخادی يە تەمامە".[2]

ئێزدييێن ئيراقێ ژ ئەفسانەيێن ئێزديان رە تێرمێن "مانا"، "پرس" و "شيرۆڤە" ب کار تينن. ئێزدييێن ئەرمەنستانێ ژی ژێ رە "مەعنا"، جارنان "پرس" دبێژن. لێ د چەند کتێبان دە تێ گۆتن کو ل ئيراقێ ئەفسانەيێن ئێزديان رە تێرما "چيرۆك" ب کار تينن، لێ ب راستی پەيڤا "چيرۆك" گەلەکە نە د ديسکوورسا دينی دە، لێ ب واتەيا "چيرچيرۆك" ئان ژی "مەتەلۆك" بێ بکارئانين.

---

[1] بەدەل ۲۰۰۲: ۳" کرێيێنبرۆك/ رەشۆ ۲۰۰۵: ۵۳.

[2] ب گۆتنێن بەدەلێ فەقير حەجی.

١. **گۆتن/ خوەندن**. د گۆتنا قەولان و ڤەگۆتنا (قسەتکرن) ئەفسانەیان دە هنەك فەرقێن بنگەهی هەنە. قەول ب شێوەیێن پۆیەتیك هاتنە دورستکرن، لێ ئەفسانە چیرۆکن. زمانێ قەولان بێتر مەجازی و نەپەنی" لێ یێ ئەفسانەیان سادە و ئاشکەرا یە. زمانێ قەولان، ل چاڤ ئەفسانەیان، پر تێکەلترە ل گەل تێرمینۆلۆژییەکە فرەهـ" لێ ئەفسانە ب زمانێ ئاخافتنێ تێنە گۆتن. قەول ب ئاوازێن مەخسووس تێنە گۆتن.

| کاتاگۆری | قەول | مەعنا |
|---|---|---|
| شێوەیێ قسەتکرنێ | پۆیەتیك | پەخشان |
| واتە | مەجازی" نەپەنی | یەکسەر" ئاشکەرا |
| تێرمینۆلۆژی | پتر تێرم تێنە بکارئانین | کێمتر تێرم تێنە بکارئانین |
| زمان | قەدیم و تێکەل | زمانێ ئاخافتنێ |
| ڤەرسیۆن | نە زێدە ڤەرسیۆن: شێوە پر گرینگە. | گەلەك ڤەرسیۆن: ناڤەرۆك پر گرینگە. |
| گۆتن | ب تەنێ مێر: ل ئیراقێ پرانی قەولان و فەقیر[1] و ل ئەرمەنستانێ شێخ و پیر. | مێر و ژن دکارن بێژن |
| ئاواز | ب ئاوازا خوە یا مەخسووس — کوبری تێ گۆتن | ڤەگۆتنێن پەخشانی |

٢. **فۆنکسیۆن**. قەولێن ئێزدیان هنەك جاران ب شێوەیێ دیالۆگێن د ناڤبەرا، بۆ نموونە، عەرد و ئەزمان (قەولێ "عەرد و ئەزمانێ")، مەها ("قەولێ مەها")، شێخ و ئاقووب (" قەولێ شێخ و ئاقووب")، چاڤ، دل، زمان و نەفس ("قەولێ ئاخرەتێ") و هتد. دە هاتنە ڤەهووناندن. هەر وسا ژی گەلەك جاران دیالۆگ د ناڤ ئەفسانەیێن ئێزدیان دە د ناڤبەرا هەفت مەلەك و خوەدێ / روح/ئادەم/عەرد، هتد. دە تێنە پێشکێشکرن. نها مەعنا ئێزدیان گەلەك جاران تێنە گۆتن:

---

[1] ب تایبەت فەقیرێن شەنگالێ.

– ژ بۆ شرۆڤەکرنا هنەك قسمێن قەولەکی: پرانـی د ناڤبـەرا هنـەك سـەبەقان دە. مومکونـە ئەفـسانەیێن وسـا د ناڤبـەرا سـەبەقان دە دەمـا خوەنـدنێ بێنـە بجیکرن.

– ژ بۆ زێدەکرنا ل تەمایا (بابەتێن) قەول: گەلـەك جـاران ل پـێش ئـان ژی د ناڤبەرا سەبەقان دە.

– وەك ڤەرسیۆنێن پەخـشانی یـێن قـەولان. رۆلا ڤەرسـیۆنێن پەخـشانی یـێن قەولان ب تایبەتی د ناڤ جەمعەتێن ئەرمەنستان و تورکییەیێ دە گرینگ کەت کـو ل وان دەران ئێزدی پر ژ مەرکەزا دینی –لالـش– دوور دژیـن و فۆرمـا ئـەدەبی یـا راگوهەستنا ئولمێ دینی تووشی گوهەرینەکێ بوو.

لـەوما مـەعنا (پـرس)، ئـان ژی چـێترە کـو وەك "ئەفـسانە" و "میـت" وەرگەرینن، ب رۆلا راڤەیێن پرەنسیبێن دینی یێن ئێزدیاتییێ رادبـن دا کـو ب ڤـی ئاوایی سـادە هـەموو ئێـزدی هێـسانتر تێبگهن. بالکێشە، نابـە کـو دەمـا قـەولان دخـوینن ل سـەر سـەبەقەکێ بقـەڤێزن، یـانی بێیـی کـو سـەبەقەکێ بخـوینن دەرباسی یەکە دن ببن. لێ بەلێ دکارن بسەکنن و سەبەقا پێـشتر ب ئەفـسانەیەکێ راڤە بکن و دوو رە دەوامیێ ژ قـەول بکـن. ئێـزدی د هـەنگاڤا مەراسـیمەکە گـرینگ دە ژی ڤێ یەکێ دکن (نموونە: مسحابەت).

هنەك ئەفسانەیێن ئێزدیان هەنە:

کو تو موقابلێن وان نینن د ناڤ قەولێن ئێزدیان دە"

کو ئانالۆژیێن (نموونەیێن هەڤتەریب) وان هەنە د ناڤ قەولێن ئێزدیان دە"

کو ئانالۆژیێن وان هەنە د ناڤ سروودێن دینی یێن ئێـزدی (قـەول) و یارسـانان (کەلام)دە"

کو هەڤبەش (هەڤپار)ن بۆ تەمایێن (بابەتێن) ئەفسانەیێن ئێزدی، یارسـتان و زەردەشتییێ.

**ئەفسانەیێن ئێزدیان کو ئانالۆژیێن وان هەنە**
**د ناڤ تەکستێن دینی یێن ئێزدی، یارستان و زەردەشتییێ دە**

دڤێ لێکۆلینێ دە ئەز چەند ئەفسانەیێن دینی یێن ئێزدیان ڤەکۆلم کو ئانالۆژیێن وان هەنە د ناڤ قەولێن ئێزدیان و هەروها تەکستێن یارسان و زەردەشتییێ دە. وەکی نموونە ئەز دێ چەند ئەفسانەیێن ئێزدیان ئێن تێکلداری دەما ئافراندنێ ڤەکۆلم، کو سەبارەت ب ئافراندنێ مانەندیێن بالکێش هەنە د ناڤ ڤان سێ دینان دە.

ئەفسانەیا ئافراندنێ یا ئێزدیان ب تەسویرا ڤالاهییێ و نەبوونا نزامێ ل کایناتێ دەست پێ دکە ("بەرێ نە عەرد هەبوو، نە عەزمان بوو، نە عەرش بوو "قەولێ زەبوونێ مەکسور[1])" "نە عەرد هەبوو نە عەزمان بوو، نە چییا نە سکان بوو" دوعا باوەرییێ.، سەب.١[2]). دوو رە خوەدێ نزامەك ("حەد و سەد") دانی ل کایناتێ ("هنگی "خوەدێ" دانە حەد و سەدە" قەولێ زەبوونێ مەکسور"[3]"). د ترادسیۆنێن ئێزدی و یارسانان دە، خوەدێ، ل زمانێ بەری دەما ئافراندنا دنیایێ، "دوڕەك" ئافراند ("پەدشێ من ب خۆ ئەفراندی دوڕا بەیازایە" قەولێ بێ و ئەلف سەب. ٦[4])، کو د فۆرما مادەیێ دە نەبوو. خوەدێ ئەو ژ نوورا خوە یا پاك ئافراند (" پادشێ من دوڕ ژ خۆ چێ کر" قەولێ شێخوبەکر.[5]) و ب تەنێ خەولە بوو د ناڤ دوڕێ دە ("پەدشا ل ناڤ دوڕێ ل خەولە بوو" دوعا باوەرییێ.، سەب.١[6]).

---

[1] پیر تۆسنێ قەرۆ.
[2] بەدەل ٢٠٠٢: ٣" کرێیێنبرۆك/ رەشۆ ٢٠٠٥: ١٠٤.
[3] پیر تۆسنێ قەرۆ.
[4] بەدەل ٢٠٠٢: ٣" کرێیێنبرۆك/ رەشۆ ٢٠٠٥: ٧٢.
[5] مەروانێ خەلیل.
[6] بەدەل ٢٠٠٢: ٣" کرێیێنبرۆك/ رەشۆ ٢٠٠٥: ١٠٤.

ب باوەریا زەردەشتییان "مەکانێ فرەهـ ئێ رۆناهییێ" هـەبوو، کو ئـاهورا — مازدا ل وێ بوو ("...دەڤـەرا رۆنـاهییێ مـەکانێ ئۆهرمـازدە، کو ژێ رە رۆناهییا بێداویی دبێژن..." بووندا هینسن.، فـر.١: ٢).[1] د هـەر سـێ دینـان دە دنیایەکـە ئەزۆتـەریك ئـان ژی خـەیری — مـادەیی هـەبوو و دوو رە مەرحەلـەیا جودابـوون و گوهـەرینا هنـەك دیاردەیـان پێکهـات. پـشتی هنگـی، خویـابوون و تەجـەلییا وان چێبوو و ئەڤ دیاردە هاتنە سەر ئەردێ. بەری ئافراندنا ڤێ دنیایێ خـوەدێ هـەفت مەلەك ئافرانـدن کـو سـەرۆکێ وان تاووسـی مەلـەك (ئێـزد.)، پـیر بنیـامین (یـار.) هاتییە تاییـنکرن، و د دینێ زەردەشتییێ دە ئاهورا مەزدا ب خوە. د کۆزمۆگۆنییا ئێزدیاتییێ دە ئافراندن، ب میتا ئافراندنا یەکەم مرۆڤـی، ئـانکو ئافرانـدنا ئـادەم، تەمام دبە. داویا ئافراندنێ، ب نێزیك ڤە تێکلدارە ب دەست ژێ بەردانا ئافرینەر ژ کار و بارێن کاینات و مرۆڤاتییا کـو وی ب خـوە ئافراندنـە و هـەروها تێکلـدارە ب دەرباسبوونا ژ دەمەکە میتۆلۆژیك بۆ دەمەکە دیرۆکی. بەری وێ، خوەدێ هـەموو کار و بارێن دنیایێ سپارتنە هەفت مەلەکان.

د شەمایا ل ژێر دە، گرینگترین خالێن وەکهـەڤ کۆزمۆگـۆنییێن سـێ دینـان دە هاتنە دەستنیشانکرن:

| زەردەشتی | یارسان | ئێزدیاتی | کاتەگۆری |
|---|---|---|---|
| نوور جـھ و مـەکانێ ئۆهرمازدە (گبنـد.، فر.١: ١–٢) | X | X | خوەدێ دورەك ئافراند ژ نـوورا خـوە یا پاك |
| X | X | X | خوەدێ ب تـەنێ خەولە بوو ل وێ |
| X | X | X | جووودابـــوون و گوهـــەرینا هنـــەك دیاردەیان |
| X | X | X | دنیا ئەول ب شێوەیێ رووحـانی و دوو |

[1] پرۆف. کریێنبرۆك وەسا دفکرە کو "ئاشکەرا یە کو ئەو موقابلێ "ئەسمانێ کەڤرێ تەنگ"ە کو ئافرینا پێشی یا د میتا بەری — زەردەشتیێ دە د ناڤ خوە دە دحەواند." (کریێنبرۆك ١٩٩٢: ٦٨).

| ره ب شێوەییَ ماددی هاتە ئافراندن. | | | |
|---|---|---|---|
| هەفت مەلەك | X | X | X |
| هەفت مەلەك بەرپرسێن ڤیَ دنیاییَ نه | X | X | X |
| هــەفت رۆژ تێکلــدارن ل گــەل هــەفت مەلەکان | X | X | X |

چەند ئەفسانەییێن ئێزدیان هەنە کو ئەم دکارن ئانالۆژییێن وان د ناڤ سروودێن دینی یێن ئێزدی و یارسانان دە و هەروها د تەکستێن دینی یێن زەردەشتییێ دە پەیدا بکن. نها ئەم چەندەك ژ وان ڤەکۆلن.

## ١. بێیتاعەتییا روح.

ئەفسانەیەکە[1] ئێزدیان هەیە کو بەحسا نەگوهداریەکە روح کو سەریَ پێشی نە دخوەست تێکەڤە قالبیَ ئادەم. پشتی کو هەفت مەلەکان داخوازێن روح قەبوول کرن، هنگی روح چوو ناڤ قالبیَ مرۆڤیَ پێشی.

| هەژمار | ئەفسانەیا ئێزدیان (کوردي – کورمانجی) |
|---|---|
| ١ | دیسا ڤیبا[2] روحی بەر قالبی بکەن، دیسا ئەوی روحی داخوازێت خۆ کرن. گۆ: "وەختیَ ئەز بکەڤمە بەر ڤی قالبی دا، وەختیَ ئـەڤا بتـە بەشـەر، ئـەڤ بەشەر دیَ خێریَ پیَ هەبن، دیَ شەریَ پیَ هەبن". گۆ: هنگی کیَ تەحەملا ویَ خەلەتییَ دکەت؟" گۆ: "وەختیَ بتە بەشەر و نەفسا وی هـەبت، ئـەو نـەفس هـەر تـشتی دخـوازت. هنگـی ئـەو ئینـسان دیَ گەلـەك سـووج و گونەهکارییا ژی بکەت. وەختـیَ ئـەو ئینـسان بمـرت، حـساب یـا ئـاخرەتیَ سەر رووحیَ یە یانیَ سەر قەلبی یە؟". |

[1] من ڤەرسیۆنێن ڤیَ ئەفسانەییَ یێن پر نێزیکی هەڤ قەید کرن. ل ناڤ ئێزدییێن ئەرمەنستانیَ: پیر تۆسنیَ قەرۆ، شێخ عەزیزیَ مراز" ژ ترکیەییَ: پێشیمام هەسەن، فەقیر عەلی" ژ ئیراقیَ: مەروانیَ خەلیل، فەقیر حەجی.

[2] خوەستی.

| ٢ | مەلایکا گۆتیێ: " نا، قالب پێش ئاخێ چێبوویە، دێ چتە ناڤ ئاخێ، دێ بتە ئاخ. بەس حەساب دمینتە سەر روحی. روح نامرت!"گۆ: ئەز نەکەڤمە بەر". گۆ:"ئەز بکەڤمە بەر ڤی قالبی دا، من داخوازێت خۆ یێت هەین". گۆتن:"داخوازییێت تە چی نە؟" |
|---|---|
| ٣ | گۆ: من دڤێت شاز و قدووم[1] هەبن و پێشییا روحی دا بچن". گۆتنە:"ئەرێ". گۆتن: "من دڤێت خەرقە هەبت، من خەرقە کەن!" گۆتن" "ئەرێ!" گۆ: "من دڤێت هەفت مەلایکا خۆ بەردەنە بەر قالبی بەرێ من! و من دڤێت ئەز بچمە بەهشتێ. ئێك ژ مەلایکا بۆ من ببە ئیمان، ل بهشتێ گەرێت...". |
| ٤ | هنگی داخوازێت وی مەلایکا قەبوول کرن. هەفت مەلایکا بەرێ روحێ خۆ بەردانە بەر قالبی. مەلایکا ب رەنگێ سوڕێ دەرکەفتن[2] ئێد چاڤا را، ئێدا دەڤی را، ئێد گوها را، ... وەختێ روح کەفتە بەرێ، ئەو قالب ل عەردی ئاخ بوو و بوو خوون و گۆشت، بوو خوون و گۆشت، هژییا، هنگی ئادەم روونشت. |

ئەم دکارن ئانالۆژییا ڤێ ئەفسانەیێ د قەولێ ئێزدی یێ "قەولێ زەبوونی مەکسوور" دە ببینن: لێ بەلێ کتەکتێن ئەفسانەیێ زێدەترن و هەروها بەحسا هنەك بابەتان دکە کو د قەول دە ئاماژە ب وان نایێ کرن. ئەم دێ نها وان پارێن ئەفسانەیێ قیاس بکن یێن کو ئەم دکارن د قزم دە ژێ رە ئانالۆژیان پەیدا بکن:

---

[1] "شاز و قدووم" ئەم دکارن د ناڤ قەولان دە ببینن، کو تێ واتەیا "دەف و شباب".

[2] روح ژ مەلەکان خوەست کو تێکەڤنە قالبێ ئادەم، و د ڤێ ئەفسانەیێ دە مەلەك تێکەتنە قالبێ ئادەم و ژێ دەرکەتن. د قەول دە ئەم دبینن کو ب تەنێ بەحسا تێکەتنا ناڤ قالبێ ئادەم هەیە، نە یا ژێدەرکەتنێ. بالکێشە، د فارسیا کلاسیك دە (ب تایبەتی د سەدسالێن ١١-١٢ ئان دە)، لێکەرا "دەر ئامەدەن"، کو سینۆنیما (هەمواتە) "دەرکەتن" ئا کوردی یە، دهاتە واتەیا "دەرکەتن"، لێ د فارسیا هەڤچەرخ دە تێ واتەیا "تێکەتن"، "چوون تێ دە"، گەلۆ ئەم دکارن تەخمین بکن کو د کوردی دە ژی ڤێ لێکەرێ واتەیەکە وەسا هەبە د کورمانجیا کەڤن دە؟.

| ژ ئەفسانەییَ (کوردی – کورمانجی) | ژ قەولێ زەبوونیێ مەکسوور[1] |
|---|---|
| گۆتن: "داخوازێت تە چی نە؟"(٢) | گۆ، روحێ، بۆچی ناچییە ناڤە؟ |
| گۆ: "من دڤێت شاز و قودووم هەبن و پێشییا روحی دا بچن"(٣). | هەتا بۆ من ژ بانا نەئێن شاز و قودوومە نیڤەکا من و قالبێ ئادەم پێغەمبەر زۆر تخوومە. |
| هەفت مەلایکا بەرێ روحێ خۆ بەردانە بەر قالبی(٤). | هەفت سور هاتنە هنداڤە. |
| وەختێ روح کەفتە بەرێ، ئەو قالب ل عەردی ئاخ بوو و بوو خوون و گۆشت، بوو خوون و گۆشت، هژییا، هنگی ئادەم روونشت. | روح هات و تێ را گهەیێ، لەو جەسەتێ ئادەم پێغەمبەر گەریا گۆشت و خوونە. ئادەم پێغەمبەر...هژییا، گۆشت لێ د هورییا، خوون تێ گەرییا. |

د ڤێ ئەفسانەیێ دە هنەك خالێن گرینگ هاتنە بەحسکرن کو د قەولێ دە ئاماژە پێ نایێ کرن:

| هەژ. | ژ ئەفسانەیێ (کوردی – کورمانجی) | خالێن گرینگ |
|---|---|---|
| ١ | گۆ، "وەختێ ئەز بکەڤمە بەر ڤی قالبی دا، وەختێ ئەڤا بتە بەشەر، ئەڤ بەشەر دێ خێرێ پێ هەبن، دێ شەرێ پێ هەبن". | یانی روح، سەرێ پێشی پاك و بێگونەهە. |
| | گۆ: "هنگی کێ تەحەملا وێ خەلەتییێ دکت؟" گۆ: "وەختێ بتە بەشەر و نەفسا وی هەبت، ئەو نەفس هەر | خالەکە موهیم هەیە ل ڤر، کو قسمەن هەبوونا تشتێن بەد (خراب) ل ڤێ دنیایێ نیشان ددە: بەشەر دێ خوەدانێ نەفسێ بە کو ئەو نەفس بەرپرس و سەبەبێ هەموو |

[1] مەروانێ خەلیل.

| | | |
|---|---|---|
| | تشتى دخوازت. هنگى ئەو ئينسان دێ گەلەك سووج و گونەهكاريیا ژى بكەت. | گونەهێن مرۆڤانە. |
| | وەختێ ئەو ئينسان بمرت، حساب يا ئاخرەتێ سەر روحێ يە يانێ سەر قالبى يە؟" | پرس و لۆمەيێن ڤان گونەهان دێ ل كێ بن؟ وەختێ دمرن، حسابا ئاخرەتێ دێ ل سەر روحێ يان قالبي بە؟ |
| ٢ | مەلايكا گۆتە: "نا، قالب پێش ئاخێ چێبوويە، دێ چتە ناڤ ئاخێ، دێ بتە ئاخ. بەس حەساب دمينتە سەر روحێ. روح نامرت!" | مەلەك دبێژە كو حساب دمينە سەر روحێ و روح نامرە. |
| | **روح بێتر دخوازە:** | |
| ٣ | گۆ: "من دڤێت خەرقە هەبت، من خەرقە كەن!" | خەرقە. |
| | گۆ: " من دڤێت هەفت مەلايكە خۆ بەردەنە بەر قالبى بەرى من! | دڤێ بەرى روح، هەفت مەلەك تێكەڤنە ناڤ قالبێ ئادەم. |
| | و من دڤێت ئەز بچمە بەهشتێ. | چوونا بەهشتێ. |
| | ئێك ژ مەلايكا بۆ من ببە ئيمان، ل بەهشتێ گەرێت... | يەك ژ مەلەكان دڤێ ببە رێبەرێ روح د بەهشتێ دە. |
| ٤ | مەلايكا ب رەنگێ سورێ دەركەفتن: ئێد چاڤا را، ئێد دەڤي را، ئێد گوها را، ..." | مەلەك ژ قالب دەركەتن و هەتا ڤێگا ئێزدى باوەر دكن كو ئەو شوون و ئيشارەتێن خوە (كو هەفت حەبن) لێ هشتن. |

ب يا كتێبا زەردەشتيیێ بووندا‌هيشنا مەزن، سەرێ پێشى فراڤاشيیان نەخوەست بێنە سەر دنيايێ لێ دوو رە قەبوول كرن (فر. ٣: ٢٣–٣٤):

